بەرەو راستکردنەوەی
میژووی سیاسیمان
( ١ )



# کوردستان



# چۆن داگیرکرا و دابەش کرا

نووسینی
سەلام ناوخۆش

چاپی دووەم
١٤٢١ _ ٢٠٠٠

بەرمو راستکردنەوەی
میژووی سیاسیمان
(١)

# کوردستان

## چۆن داگیرکرا و دابەش کرا؟!

نووسینی
سەلام ناوخۆش

چاپی دووەم
١٤٢١ — ٢٠٠٠

# پێشەکی

مێژووی کورد وا لە تاکی کورد شێواندراوە کە بە جۆرێ لە هەندێ حاڵەتدا ئەستەم بێ بتوانێ "داگیرکەر" لە "رزگارکەر" جیا بکاتەوە. ئەو حاڵەتە سایکۆلۆژیەش چەندەها فاکتەر لە پشتیەوەن. راگەیاندنی رۆژئاوا و "مەدەنیەت" و پێشکەوتنی رۆژئاوا و کاریگەری رۆژئاوا بەسەر دەوڵەتە ئەقلیمیەکان و هەندێ لە سەرانی رۆژهەڵات هەندێ لەو هۆکارانەن ئەمەش زیاتر، رۆژئاوا نەک هەردەبێـەوێ و هەوڵی داوە خـۆی وەک رزگارکـەر دەربخات بەڵکو پیلوانی خۆی لە ناوچەکە وا تەلقین داوە کەسەر لە تاکی کورد بشێوێنن وای زەن پێ ببەن کە ئیسلام خوی داگیرکردنی بە سەر کورد سەپاندوە. وەک بڵێی کورد کاتی خۆی دەوڵەت و نیشتمانی سەربەخۆ و دینی هەبووە ئیسلام هاتووە دەوڵەتی داگیرکردومو کەسایەتی کوردی داروخاندووە ؟! کەچی لەراستیدا کاتێ ئیسلام هاتە کوردستان کورد زیاتر لە هەزار ساڵ بوو دەوڵەت و کەلەتورو مێژووی لە ژێر دەسەڵاتی ساسانییەکان بوو، بۆیە ئیسلام بۆ کورد هێزێکی رزگارکەری رۆحی و دینی و کەلتوریو هەتا قەومیش بوو، ئەمەش شتێکی چاوەڕێکراوبوو هەروەک ڕوشیدا کورد لە زۆر شوێن بەبێ شەڕ بوونە ئیسلام و هاریکاری سوپای ئیسلامیان کرد، بەنەمانی دەسەڵاتی شەرعی ئیسلام، گلۆرەی کورد کەوتە لێژی، نەتەوە براکانی لە دینـدا وەک عەرەب و فارس و تورک نەک هەر پشتیان لە دین و مێژوو کرد، بەڵکو سەرانی ئەو میللەتانە هەرچیان لە دەست هات لە دژی کورد دریغیان نەکرد لە ئاکام کورد باجی ئەو برایەتییەی دایەوە.

ئەو هەڵوێستەی سەرانی ئەو میللەتانە، دەتوانرێ بە دوو هۆ لێک بدرێتەوە:

یەک: بەحوکمی ئەوەی ئەوان لە مێژوودا خاوەن ئیمپراتۆریەت بوون وەک ئیمپراتۆریەتی ئەمەوی و عەباسیو عوسمانی و قاجاری و سەفەوی.

دوو: دەوری رۆژئاوا لە دروست کردنی ئەو هەڵوێستەدا.

ئەم کتێبە لە پێنج بەشی پێکهاتووە.

بەشی یەکەم تایبەت بە مەسەلەی سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزم وکاریگەری ئەو بیرۆکەیە لە دروست کردنی ململانێ لە نێوان گەلانی رۆژهەڵاتدا بەتایبەتی گەلانی ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی.

بەشی دووەم تایبەتە بە گروپی ئیتحادو تەرەقی وستراتیژیەتی و ئائدیۆلۆژیای ئەو گروپـە و هەڵوێستیان بەرامبەر بە کورد و مەسەلەی کورد. لەم بەشەدا جەخت لەسەر ئەوەکراوە کە ئەو گروپە گروپێکی دەستکردی یەهود و رۆژئاوا بوونــە دەورێکـی زۆر گرنگیـان بینیـوە لـە روخاندنی خەلافەتی ئیسلامیدا بە جۆرێ ئینقلابەکەی ١٩٠٨ سەرەتای روخانی خەلافەت بووە.

بەشی سێ یەم لەبارەی کەمالیەت و شەڕی سەربەخۆیی کەمالیەکان هــەروەها هەڵوێسـتی بەرایی و کۆتایی کەمالیەت لەبەرامبەر خەلافەت و مەسەلەی کورد دا.

بەشی چوارەم تایبەتە بە هەڵوێستی ئینگلیز لە بەرامبەر مەسەلەی کورد لەم بەشەدا ئەوە خرایەتە ڕوو کە ئینگلیز چۆن لەبەرایی دا هەوڵی دەدا ئینشقاق لە نێو سەرانی کورد دروست بکات لە لایەک لە ژێرەوە ڕێککەوتنامەی سایکس بیکۆی دارێژت بوو لە لایەکی دیش بە

جۆرێکی شاراوە بە پەیمانی سیڤەر کوردی چەواشە دەکرد و کەمالیەتی سەردەخست.

بەشی پێنجەم لە پەیمانی سیڤەر و لۆزان دەدوێ لــەم بەشــەدا هــەوڵ دراوە ئــەو هۆکارانـە بخرێتە ڕوو کە دەوری گرنگیان هەبوو لە تــەواو لکـاندنی کوردسـتانی باشـوور بـە عـێراقی عەرەبی هەروەها پێ داگرتنی بـەریتانیا لەسـەر جـێ بـەجێ کردنـی داگـیرکردن و دابـەش کردنی کوردستان لەرێگای کۆمەڵەی گەلانەوە.

لەئاکام ئەوە دەرخراوە کــەرۆژئاوا بەسـەرکردایەتی ئینگلـیزو سـۆڤیەتی ئەوسـا مەسـەلەی دابەش کردنی کوردستانیان کردۆتە مەسەلەیەکی حەتمی.

سلام ناوخۆش

٢٧/ ٥/٢٠٠٠

# ١-دووچەمكی ستراتیژ جیاواز

ئەمڕۆ دووچـەمكی سـۆزی نەتەوایـەتی و ناسیۆنالیزم (بـیری نەتـەوە پـەرستی) لەلای زۆر كەس بەمەبەست و بێ مەبەست تێكەڵ یەك دەكرێن، جـابۆ ئـەوەی تـەم و مژ لەنێوان ئەردووچەمكە نەهێڵین، وادەخوازێ، هەردووك روونبكرێنەوە.ئەوەی من لەسۆزی نەتەوایەتی گەیشتبم، سۆزی نەتەوایەتی خەسڵەتێكی مرۆڤانەیە، هەڵوێستی مرۆڤـە بەرامبەر ئەو گەل و دەوروبەری تێیدا دەژی. ئەو سۆزەش فیترەیەكی خواییە، بـەواتای ئەوسۆزە لەسەر عەقیدەیەك دامەزراوە، هەر ئەو عەقیدەیەش مرۆڤ ئاراستە دەكا بەرەو چاككردنی كۆمـەڵ و پاراستنی بەرژەوەندییە سـتراتیژیەكانی نیشـتیمان لـە هـەموو نەیارێك، هەروەها پێویستە ئەوەش بوترێ، كە ئیسلام نـەفی سـۆزی نەتەوایـەتی ناكات بەمەرجێ ئەو سۆزە لە چوار چێوەی جیهانبینی ئیسلامی دابێ‌و بەتێروانینێكی مـەعریفی ئیسلامی مامەڵە لەگـەڵ تاكەكانی كۆمەڵەكەی بكات.لەروانگەی(انصر أخاك ظالما أو مظلوما) هەڵوێست وەربگرێ، نەك هەموو كەس و دابێكی كۆمەڵەكەی قـەبووڵ بكا. بە واتای نابێ(مشرك)ێكی نەتەوەی خـۆی خۆشـتر بـوێ لـە موسـڵمانێكی نەتەوەیـەكی تـر. ئـالێرەدا، هێڵی جیاكـەرەوە لـەنێوان سـۆزی نەتەوایـەتی‌و ناسیۆنالیزم بەدەردەكـەوێ: (لاتجد.......... أو عشيرتهم) ئاسۆی جیهانبینی ئیسلام زۆر لـەوە فراوانـترە، كـە هـەموو جیهانی لە كۆمەڵێكی بچوكی بەرژەوەندی هاوبەش تەسك بكرێتەوە، هەر بۆیە هـەركاتێك ئەو سـۆزە لەچوارچێوەیـەی سـەرەوە دەرچـوو، ئـەوە لـەچوار چێـوەی فیـترەی مـرۆڤ دەردەچـێ، دەبێتـە مەزهـەب و دینێكـی سـەربەخۆ. بەواتایـەكی تـر، هـەركاتێك سـۆزی نەتەوایەتی، دەمارگیری نەتەوەیی تـێ كـەوت بووبـە نەتـەوە پەرستی دەبـێ پشـت لـەو مەزهەبە فكرییە بكرێ(دعوها فإنها منتنه).

ناسیۆنالیزمیش، وەك دیاردەیەكی كۆمەلآیەتی، یان وەك مەزهەبێكی فیكری، هەر ئایدۆلۆژیایەك بەجۆرێك پێناسەی كردووە، بەلآم پێش ئەوەی لە ناسیۆنالیزم بكۆڵینەوە، بابەكورتی سەرنجێك لەچەمكی نەتەوە Nation بدەین، بزانین نەتەوە چییە، هەربۆ نموونە(د.ستاروشنكۆ) لەبارەی نەتەوە دەڵێ: (نەتەوە ئەو كۆمەڵە خەڵكانەن كە بەدرێژایی مێژوو دروست بوون و جێگیر بوون، بنەماكانی نەتەوەش زمان و خاك و ئابووری هاوبەش و ژیانی سایكۆلۆژی هاوبەشن).[٣]
كاتێ كۆمۆنیستەكانی یەكێتی سۆڤیەت، مەرجی ئابووری هاوبەشیان بەمەرجی نەتەوە بوونی هەر گروپێكی ئەتنیكی دانا مەبەستێكی سیاسیان لەپاڵ هەبوو، چونكە شتێكی بەڵگە نەویستە، كەئابووری هاوبەش تەنها ئەو كاتە دێتەكایەوە كەئەو نەتەوە دەسەلآتی سیاسی یان دەوڵەتی هەبێت. هەرچی ئیڤانۆڤە: بەشێوەیەكی شاملتر لەنەتەوە دەڕوانێ و دیدو بۆچوونەكەی ئەویش زیتر هەر ئەو گروپە ئەتنیكانە دەگرێتەوە كەسنورێكی جوگرافی دان پێدانراو كۆیان بكاتەوە، هەروەك دەڵێ:
(میللەت لە كۆمەڵە خەڵێك پێك هاتووە كە خاوەنی یەك هەڵسوكەوت بن .چ لە لەش و چ لەبارەی دەرونیان، یەك نەریت بیانگرێتەوەو ئامانجیان یەك بێ... ئەو ڕەگەزانەی كە هەڵس و كەوتی نەتەوەیەك پێك ئەهێنن و ئەیپارێزن ئەمانەن: یەكێتی ڕەگەز، سنوری جوگرافی، زمان،ئایین، وێژە، كەلەپور، بیرو باوەڕ، چۆنێتی ژیان، یەكێتی ڕامیاری، مێژووی هاوبەش، هەروەها هاوبەشی لەرێرەوی رۆشنبیریدا.[٤]
ئیسلامیش لەسەر بنەمایەكی ئینسانی باسی بوونی نەتەوە دەكا، جیاوازی هەر نەتەوەیەكیش لە نەتەوەیەكی تر بە ئایەتێكی خودایی دادەنێت. ئەمەو بۆ ئەوەی دەمارگیری نەتەوەیی دروست نەبێ، هەموو نەتەوەكان بەیەك نەتەوە تەماشا دەكا. ئەو نەتەوەیەش عەقیدەیەكی پاك بەڕێوەی دەبات. هەروەها لە دیدی ئیسلامدا هەر

نەتەوەیەك دوو نیشتمانی هەیە، نیشتمانی قەومی خۆی - زێدی خۆی، خاکی باوك و باپیرانی - هەروەها نیشتمانی ئیسلامی -دەوڵەت ئیسلام موڵکەی هەموو نەتەوەیەکی موسڵمانە، بەڵام دەبێ هەستی خۆی بەنەتەوە زانین کە تیرەی بڕبڕەی بوونی نەتەوەیی یە ° بەمەرجێ مامەڵەیەکی مەعریفانەی دەگەڵ بکرێ، ئەگەر نا مرۆڤ بەرەو ناسیۆنالیستی و نەتەوە پەرستی ئاراستە دەکا. محمد قطب لە کتێبی (مذاهب فکرية معاصرة) بە کورتی و پوختی پێناسەی نە... دەکا

(رۆڵەکانی یەك رەگەزو زمان پێویستە وڵاتیشیان یەك بێت، هەرچەندە خاکیان جیاوازو نیشتمانیان پەرش و بڵاوبێت. هەروەها لە ناسیۆنالیزم دەفامرێتەوە، کەئەو رۆڵانەی خاوەن یەك رەگەزو یەك زمانن خەبات بکەن بۆ ئەوەی نیشتمانیان یەك بگرێتەوە بەجۆرێك تەنیا یەك نەتەوە لە نیشتمانێکی شامیل (گەورەدا) کۆببێتەوە. لەو نیشتمانەش خۆشەویستی بۆ قەومیەت پەیوەستەبەخۆشەویستی بەخاکەوە. بەڵام هەرچۆنێ بێ خۆشەویستی بۆ قەومیەت هەر بە ئەصل دەمێنێتەوە، هەرچەندە یەکێتی خاکیش نەیەتە دی)٦

ناسیۆنالیزم وەك مەزهەبێکی فکری خاوەن تاکتیك و ستراتیژی سەربەخۆ، ئەمڕۆ وەك بەدیلێك بۆ ئیسلام و مارکسیەت، خۆی دەنوێنێ ... ئیسلام ماهیەتی ناسیۆنالیزم تەعبیر لە جاهلیەت دەکا. بەحوکمی ئەوەی هەڵگرانی بیری ناسیۆنالیزمی وەك عەقیدەیەکی فکری و سیاسی پەیڕەوی ناسیۆنالیزم دەکەن.هەر بۆیە بەهیچ جۆرێك ناسیۆنالیزم بەبەشێك لە خۆی نازانێ، ئەوانەی بانگەشەی ئەوەش دەکەن کە ناسیۆنالیزمی عەرەبی روحەکەی ئیسلامە یان(العروبە) لە ئیسلام... سەرچاوەی گرتووە، ئەوە یا لە ئیسلام و(العروبە) نەگەیشتوون یان مەبەستی سیاسی خۆیان هەیە. بەدیدی ئێمە رای دووەم راسترە،ئەمەو ئەگەر بزانرێ کە ناسیۆنالیزم عەقیدەیەکی

دەستکردی مرۆڤەو هەروەها ئاسۆی جیهانبینی ناسیۆنالیزم زۆر بەرتەنگە، هەرچی مارکسیەکانن، ئەوانیش لە هێلێکی تر، بە ئامانجێکی سیاسی رەدی ناسیۆنالیزم دەکەنەوە.

بەگوێرەی مارکسیەت ناسیۆنالیزم دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی قۆناغی بەناو دەرەبەگایەتیو سەرمایەدارییە. لە قۆناغی شیوعیەتدا ناسیۆنالیزم نامێنێ بە حوکمی ئەوەی بەناو مارکسیەت بە چاوی ئوممەی لەنەتەوە دەڕوانێو بە پێوەری چینایەتیش مامەڵە لەگەڵ کۆمەڵ دەکات. هەر بۆیە مەسەلەی چینایەتی لەپێشەوەی مەسەلەی قەومیەت دێ. هەروەك لینین دەڵێ:مەسەلەی نەتەوایەتی لەچاو مەسەلەی پرۆلیتاریادا بە پلەیەکی کەم گرنگتر دێت.[٧]

## ٢-سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزم

لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتی رۆمانیدا ئەوروپا یەکەیەکی سیاسی بوو، ئەو یەکە سیاسییە عەقیدەیەکی نەصرانی بەڕێوەی دەبرد.هەر وەك چۆن ئەوروپا خاوەن یەکەیەکی سیاسی بوو، کە هەموو گەلان و زمان و رەگەزەکانی ئەورووپی لەخۆدا گرد کردبۆوە.[٨]

هەروەها خاوەن یەکەیەکی ئایدۆلۆژی بوو، ئەویش دەسەڵاتی کەنیسەی لاتینی رۆما بوو، لەگەڵ بوونیئەو دوو یەکەیەش، یەکەی سیاسیو یەکەی دینی، هێشتا چەمکی ئوممە بە واتا جەوهەرییەکەی پێك نەهاتبوو، لەدیدی ئیمپراتۆریەتی رۆمانیدا دەوڵەتی دایك کە ئوممەی مەجازی ئەورووپی دەگەیاند، دەسەڵاتی موتڵەق بوو هەرچی موستەعمەراتیش بوون، کە بەزەبری هێز بە ئیمپراتۆریەتەوە لکاندرابوون، گەلانی بێ دەسەڵات و کۆیلە بوون.[٩] لەنێوەندە هەرگیز یەکەیەکی عەقیدەیی رەسەن، یەکەیەکە روحی پتەو

ناخولقێت. ئەو دەسەڵاتە موتڵەقەی کەنیسەی ڕۆما بەدەستی هێنابوو، نوقلانەی شۆڕشێکی لێدەکرا، چونکە پاوانخوازی دەسەڵاتی دینیو دەسەڵاتی دەوڵەت بۆ چەند چینێك، جۆرە یاخی بوون و تورە بوون و ڕقێکی پیرۆز لەلای بەرامبەر دروست دەکا، هەربۆیە هاوکات دەگەڵ ململانێی مەلیکەکان لەدژی کەنیسە، بزووتنەوەیەکی ریفۆرمی دینی- یش سەری هەڵدا. لۆسەر١٤٨٣- ١٥٤٦ کە ڕابەری ئەو بزوتنەوە دینییە چاکسازییە بوو، لە شەڕەکەیدا دژی کەنیسەی ڕۆما پشتی بەگەلی ئەڵمانی بەست، چونکە خۆی ئەڵمانی بوو، ئەو شەڕەی لۆسەر کە بەناوی بزوتنەوەیەکی ریفۆرمی دینی بوو، بەڵام لەبنەڕەتدا بنەمای سەرهەڵدانی بزوتنەوەی ناسیۆنالیستی داڕشت. مامۆستا الندوی دەڵێ(کاتێ بزوتنەوەکەی لۆسەر یەکێتییە دینیو ڕۆشنبیریەکەی ئەورووپای لەنێو برد، کیشوەری ئەورووپای بۆ چەند ئیمارانێکی میللی جیاواز دابەش کرد. کێشەو ململانێی ئەو ئیماراتانە هەڕەشەیەکی ترسناکی نەمر بوو لەسەر ئاسایشی جیهانی ئەوسا).[10]

دوابەدوای بزوتنەوەکەی لۆسەر، هەریەك لەفەرەنسا و ئیسپانیا کەوتنە شەڕێکی شەست و پێنج ساڵی(١٤٩٤- ١٥٥٩) ئەو شەرە لە مێژوودا بەنا جەنگەکانی ئیتاڵیا بەناوبانگە.مەبەست لەو شەڕەش زێتر فراوانکردنی دەسەلات ودەست بەسەراگرتنی ناوچەی نوێ بوو لە نیمچە دوورگەی ئیتاڵی، لەپاشانیش کۆنترۆڵکردن و سەپاندنی دەسەڵاتی سیاسی بەسەر کیشوەری ئەورووپادا.[11]

لەو پێودانگەوە مرۆڤ دەرك بەوە دەکا، کە بزوتنەوەی ناسیۆنالیستی بەراییدەورێکی گرنگی بینیوە لە هەڵوەشاندنەوەی یەکەی سیاسیو دینی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا.لێرەدا نابێ ڕۆڵی تیۆرکەی داروین یش (البقاء للأصلح) فەرامۆش بکەین، لەنەزەری نەتەوە باڵادەستەکان هەریەکە خۆی بە(الأصلح) دەزانێ بۆ ئەوەی حوکمی

ناوچەکە بکات. لە نەزەری کەنیسەش هەریەك لە بزوتنەوەی قەومیو نا-دینییەکان بزوتنەوەی هەلگەڕاوەکانن. هەروەها زەنیان وابوو کە نەصرانیەت و دەمارگیری ناسیۆنالیستی دووتای یەك تەرازوون، هەرچەندە دەسەلاتی کەنیسە لا واز بێ هەستی ناسیۆنالیستیو(نادینی) زێتر دەبێ.

ئەمەو ناسیۆنالیستیی یاخود بیری نەتەوە پەرستی وەك مەزنەبێکی فکریو سیاسی وەك بەدیلێك بۆ کەنیسە (فکری دینی) لەگەل هەلایسانی ژیلەمۆی شۆڕشی سیاسیو تەکنەلۆژی فەرەنسا، چوار چێوەیەکی بەرنامەیی وەرگرت. شۆڕشی فەرەنسیو وەرچەرخانێکی مێژوویی لەژێرخانی سیستەمی کۆمەلایەتیو رەوتی رژێمی سیاسی فەرەنسا دروست کرد.[١٢] هاوکات لەگەل ئەو شۆڕشەدا کە خۆی لەخۆیدا ئەویش ململانێی گەلانی بەهێزتر کرد. بیری نەتەوە پەرستیو نەتەوە پەسندی چوار چێوەیەکی فەلسەفیشی وەرگرت بەجۆرێك مەسەلەی ناسیۆنالیستی فەرەنسی لەگەل شۆڕشەکە تەواو ئاوێتە کرابوون: دروشمە دیارەکانی وشیاری نەتەوەیی و وشیاری سیاسیو بە پیرۆز زانینی رەگەزی فەرەنسیو پەسەندکردنی یان سەپاندنی فەرەنسا بەسەر ولاتاندا- کە ئەمانە هەمووی بنەمای توندڕەوی نەتەوە پەرستین- بوون بەمەرجی نیشتمان پەروەری.[١٣] ئەوانەی دەبێژن فەرەنسا لەسەروو هەموو شتێکەوەیە ئەوانە نیشتمان پەروەرن.[١٤]

هەرلەمندالدانی ئەو شۆڕشە نوێیەدا، جارێکیتر دەسەلاتی موتلەقیو کۆیلەیی بوژێنرایەوە، بەلام ئەمجارە چوارچێوەیەکی بەرنامەیی وەرگرت بەجۆرێك چەمکی نەتەوەی گەورە، نەتەوەی بالادەست، نەتەوەی بچووك ژێردەست بوون بە دەستوری پیرۆز.[١٥] ناسیۆنالیستە ئینگلیزەکانیش هەروەك نەتەوەیەکی بالا دەست مافیان بەخۆیان دەدا کە بە ئارەزووی خۆیان ئاراستەی گەلانی غەیرە - نەصرانیو گەلانی بچوك

بکەن.ئەو دیاردە ناسیۆنالیستی‌یە لەئەدەبی ئینگلیزی‌دا زۆر بەزەقی دیارە، بەجۆرێك یەکەم رۆمانی ئینگلیزی(رۆبنسن کرۆزۆ) یەکەم رۆمانی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی‌یە، کەباس لە داگیرکردنی ناوچەیەکی تر دەکاو مافی ئەوەش بەئینگلیز دەدات گەلی تر ئاراستەی بکات. هەروەها (برۆك)ی شاعیریش ئەو هەستە ناسیۆنالیستە ئیمپریالیەی خۆی لە شیعری (The Soldier) زۆر بەئاشکرا دەردەبڕی بەوەی هەر سەربازێکی ئینگلیز لەهەموو شوێنێك بکوژرێ ئەو خاکە خاکی ئینگلیزە:

ئەگەر مردن بەگژم داهات
تەنیا ئەوەندە منتان وەبیربێ
چەند گۆڕێك (گۆڕی سەربازانی ئینگلیز)
لەکێلگەکانی بێگانەدان
ئەوانە هەتا هەتایە خاکی ئینگلیزن.[16]

بەو تێڕوانینە ئیمپریالیەوە، هەردوو ئیستعماری جیهانی، فەرەنسی‌و بەریانی، بیری ناسیۆنالیزمیان بۆ رۆژ هەلاتی ئیسلامی هێنا.پاش ئەوەی رۆژئاوای صەلیبی دەرکی بەوە کرد کەبەزەبری عەسکەری ناتوانێ جیهانی ئیسلامی داگیر بکات، بیریان لەوە کردەوە کەبە شێوازێکی تر جیهانی ئیسلامی داگیربکەن

ئەویش داگیرکردنی فیکریە. وروژاندنی دەمارگیری قەومی ئامانجێکی ستراتیژی ئەو دوو ئیستعمارە بوو.

(نابلیون) رابەری ناسیۆنالیستی فەرەنسی داگیرکەرە، هەر بۆ ئەوەی شەرعیەتێکیش بە داگیرکردنەکەی بدا، کاتێ کە هات (مصر)داگیربکا ئالأی(لا إلە إلا الله)ی بەرزکردبۆوە[17]. لەو روانگەیەوە ناپلیۆن گەورەترین سەرکەوتنی بەدەست هێنا. هەروەها وروژاندنی هەستی قەومی مصری‌یەکان و هاندان بۆ جیابوونەوە لەخەلافەتی

عوسمانی، هەروەك چۆن مەلیك و ناسیۆنالیستەکانی فەرەنسی لەدژی دەسەڵاتی کەنیسە راپەرین، ئاکامی خۆی پێکا، بەواتای ناپلیۆن بە مصریەکانی دەوت: ( ێمەی فەرەنسی ئەوکاتە گەیشتین بەو حەزارەت و تەکنەلۆژیا نوێیە، کەرزگارمان بوو لە جەورو ستەمی دەسەڵاتی کەنیسە ئێوەش ئەو دەمە رزگارتان دەبێ، کو خۆتان تەبەنی فکری قەومی ئێمە بکەن و دژی دەسەڵاتی خەلیفە راپەرن) ئەمەو ئەگەر چی لە ئایدۆلۆژی قەومی رۆژئاوا وەك بەدیلێکی دینی نەصرانی لەدایك بوو، بەڵام (رقی صەلیبیەت) یان بەرامبەر ئیسلام هەر هەبوو، هەر بۆیە ئەوان لەجیهانی ئیسلامدا، داگیرکەرێکی صەلیبی بوون!

لەولاوەش فکرێکی قەومی توندرەو خۆی مەڵاس دابوو. ئەویش هەروەك نەصرانیەکان باوەریان وابوو، کە داگیرکردنی فکری سەرەتایەکی پێویستەبۆ داگیرکردنی عەسکەری جیهانی ئیسلامی! جولەکەکان لە (نەصرانی)یەکان بەتالۆ کەتردوون بۆ لێدانی خەلافەتی عوسمانی. ئەوە بوو لە ساڵی ١٨٩٧ کۆنگرەیەکیان لەشاری (بازل)ی سویسرا سەرەتا بریار درا (نیشتمانێك) لە ئەرژەنتین یان ئۆغەندە بۆ خۆیان دابمەزرێنن، بەڵام یەکێك لەو (٢٠٤) ئەندامی کۆنگرە کە ناوی (تیودۆر هرتزل) بوو سوور بوو لەسەر ئەوەی دەبێ دەوڵەتی یەهودی لەفەلەستین دابمەزرێ [١٨] . هەروەها وستیشی کە دەبێ لەماوەیپەنجا ساڵی تر ئەو دەوڵەتە دابمەزرێ [١٨] چەند ساڵێك پاش ئەم کۆنگرەیە، (هرتزل) پارەیەکی زۆری پێشکەش (سوڵتان عبد الحمید)ی دووەم کرد، کە رێ بەجولەکەکان بدا، دەوڵەتێك بۆ خۆیان لەفەلەستین دابمەزرێنن، بەڵام سوڵتان (عبد الحمید) زۆر بەتوندی رەدی هرتزلی داوە، وتی: (ناتوانم واز لەبستێکی خاکی فەلەستین بێنم، فەلەستین موڵکی من نییە، موڵکی ئوممەی ئیسلامە ... تامن بمێنم فەلەستین هەر بەشێك دەبێ لەخەلافەتی ئیسلامی .. کە خەلافەی ئیسلامی نەما، ئەو کاتە جولەکە دەتوانن بە بێ پارە فەلەستین داگیربکەن) [٢٠] . وەنەبێ هرتزل تاکە جولەکە بووبێ کە

هەوڵی دابێ ڕەوشی سیاسیو ئابوری ئیمپراتۆریەت بقۆزێتەوە، بۆ ئەوەی سوڵتان(عبد الحمید) رازی بکەن کە واز لەفەلەستین بێنێ بۆ جولەکەکان. لەساڵی ١٩٠١ ، سێ جولەکە بەناوی: مزراحی قراصو، جاك، و لیوێن، ئەو پێشنیارەی خوارەوەیان پێشکەش بە عبد الحمید کرد:

١) هەموو قەرزەکانی دەوڵەتی عوسمانی دەدەینەوە.

٢) ئەستولێك بۆ دەوڵەت دروست دەکەین.

٣) ٣٥ ملیۆن لیرەی زێڕ قەرز دەدینە دەوڵەتی عوسمانی بەبێ سوود بۆ بوژاندنەوەی دارایی دەوڵەت.

## بەرامبەر:

١) رێ بەیەهودیەکان بدرێ هەر ڕۆژێکی ساڵ زیارەتی فەلەستین بکەن.

٢) رێ بەیەهودیەکان بدرێ موستەعمەرەیك لەنزیك قودس بۆ خۆیان دروست بکەن، بۆ ئەوەی لەکاتی زیارەتکردنەکەیان بچنە لای کەس و کاریان.

پاش ئەوەی عبد الحمید ئەمە دەبیستێ بریار دەدا کەهەرچی زووە بە دوای یەهودیەکان بگەڕێن لەفەلەستین بەتایبەتی (قدس) [٢١].

ئەم هەڵوێستەی عبد الحمید تەواو یەهودیەکان؟؟ هەراسان دەکات، هەر بۆیە وەك ناسیۆنالیستە نەصرانیەکان لە دوای ئەلتەرناتیڤ دەگەڕێن، یەهودیەکان بەتایبەتی جولەکەکانی دۆنمە [٢٢] کەوتنە هاندانی تورکە لاوەکان و وروژاندنی هەستی ناسیۆنالیستیان. هەردوو تەیاری نەصرانیو یەهودی، کەلە ئەصلدا دوژمنی سەرەکی یەکترن، هەریەکەی لەلایەك کەوتنە هاندانی گەلانی نێو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. لەلایەك جولەکەکانی دۆنمە کەبەمونەزری ئیتحادو تەرەقی دادەنرێن، تورکە لاوەکانیان هانەدا کە بانگەشەی تۆرانیەت(قەومیەی تورکانە پێش ئەوەی موسڵمان بن) بکەن و

دروشمی گورگی بۆر (پەرستراوی تورکەکان بووە لەسەردەمی جاهیلیان) بەرز بکەنــەوەو نەهێڵن عەرەبەکان دەست بەسەر ئیمپراتۆریەت دابگرن.

لـەو لاوەش وەك کاردانەوەیـەك عەرەبـەکانیش دروشمـی جاهیلی خۆیـان بەرزبکەنــەوەو هەست بکەن کەلەرووی قەومیەوە لەدەست تورکـان دەچەوسێنرێنەوە. وەك لـەپێش تـر ئامارەمان بۆکرد، صەلیبیەکانیش کەوتنە هاندانی عەرەبـەکان، بـەجورێك کەسـێکی وەك (ئیـدوارد تومـاس لۆرانـس) مونزیـرو هەڵگیرسـێنەری ناسیۆنالیستی عـەرەبیو شۆرشـی عەرەبی لە دژی دەوڵــەتی خەلافـە بـوو [٢٣] . بـەڵێ جولەکـەکان توانیـان لـەرێگای ئیعـلان کردنی مەشروتیەت، هەم عبد الحمید لەسەر حوکم لاببەن و هـەم هەستی ناسیۆنالیستی لەناو ئیمپراتۆریەت بوروژێنن [٢٤] . لەو بارەیەوە یەهودیەکی وەك (ئۆسکار لیڤـی) هەستی دڕندانەی خۆی پێ ناشـاردرێتەوەو دەڵـێ: ئێمـەی جولەکـە گـەورەی جیـهان وتێکدەری ئەوین، هەروەها بزوێنەری بەلاو جەلادی ئەوین) [٢٥] .

پاش ئەوەی جولەکە لەرێگای ئیتحاد تەرەقیەوە توانی عبـد الحمیـد لابـەرێ، سیسـتەمی دەوڵـەتی پـاش عبـد الحمیـد ، بووبــە سیســتەمی نیشـتمانی و جۆرێـك لەعەلمانیــەتی شاراوە..... بێگومان گۆڕینی ڕەوتی ململانێ لە نێوان ئیسلام و نەصرانیەت و یەهودیـەت بۆ ململانـێی نیشـتمانی یـان ناسیۆنالیستی، ئامـانجێکی سـتراتیژی بزوتنـەوە قەومیـە داگیرکەرەکان بوو، چونکە تا ئیسلام ئەصڵ بوو قەومیەت پاشکۆ بوو، نـە صەلیبیـەت و نەیەهودیەت جورئەتی ئەویان نەکرد ڕوو بەڕووی دەوڵەتی خەلافە ببنەوە [٢٦] .

# ٣. بۆچی ناسیۆنالیستی عەرەبی و تورکی بزوتنەوەی ناسیۆنالیستی داگیرکەرن؟

ناسیۆنالیستە رۆژئاواییەکان بە رزگابوون لەدەسەلاَتی موتلەقی کەنیسەی رۆمانی، یەکەی سیاسیو دینی ئەوروپایان روخاند. بەواتای ئەوان پەسندی قەومی یان بە بەدیلی ئوممەی مەجازی ئەوروپا دانا. لەدەولەتی خەلافەی ئیسلامیش، وێرای ئەو لادانە بەرچاوی سولَتانەکانی عوسمانی لە شەریعەتیئیسلام،کەسولَتا سولێمانی قانونی بەرابەری ئەو لادانە دێ [٢٧].لەسەردەمی دەسەلاَتی عبد الحمید، دەیویست جارێکی تر لەدەولەتی خەلافەدا یەکەیەکی رۆحیو ئوممەییو سیاسی دروست بکاتەوە. ئەو هەولەی عبد الحمید واتای رەنج بە خەساری بزوتنەوەی ناسیۆنالیستیو وصەلیبیو یەهودیەتی دەگەیاند، چونکە ئامانجی ستراتیژی بزوتنەوە ناسیۆنالیستەکانی رۆژئاوا لە رۆژهەلاَتی ئیسلامیدا روخاندنی خەلافەتی ئیسلامیو وروژاندنی بیرۆکەی قەومی بوو. لێرەدا دێینە سەر ئەصلی مەسەلەکە، مەبەست لەدروست بوونی ناسیۆنالیستی تورکیو عەرەبی چی بوو؟ ئایا تورک وعەرەب هەر خۆیان بزوێنەری ئەو بزوتنەوە ناسیۆنالیستیە بوون، بۆ ئەوەی لە ئیسلام رزگاریان بێ؟

هەریەك لەعەرەب و تورك، بەحوکمی ئەوەی ماوەیەکی زۆر دەولەتی خەلافەی ئیسلامی بە رابەرایەتی ئەوان بووە، تەواو درەکیان بەوە کردوە کە بە هۆی ئیسلامەوە لەبت پەرستیو گورگ پەرستی رزگاریان بووە، هەروەها چاك دەیانزانی ئەگەر لە ئیسلام لابدەن ئەو شکۆیەیان نامێنێ کە ئیسلام بە موسلَمانانی دەبەخشێ﴿ وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الأَعْلَوْنَ إِنْ كُنتُمْ مُؤْمِنِينَ ﴾ سوره ال عمران/الایه ١٣٩،﴿وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾ سوره الانعام/ الایه١٥٣

کەواتە عەرەبێتی یاخود ناسیۆنالیستی عەرەبی بیرێکی سروشتی نی‌یەو زادەی واقیع بیرو هەستی مرۆڤی عەرەبی موسڵمان نی‌یە بەڵکو هەروەك مێژوو پێمان دەڵێ: یەکە گروپ کەبانگەشەی ناسیۆنالیستی عەرەبی کردبێت (نەصرانیەکانی لوبنان و سوریا بوون لە پاشان ئەو موسڵمانانەی کە لە قوتابخانە تەبشیریەکان پەروەردە کرابوون[٢٠] جۆرج ئەنتۆنیۆس لە (یقظة العرب) هەمان راستی دەدرکێنێت دەنوسێت: بیری ناسیۆنالیستی عەرەبی لە ژێر چاوە دێری ئەمەریکا (بە هۆی بوونی جامیعەی ئەمریکی لە لوبنان) لەلایەك و کاریگەری بزوتنەوەی تەبشیری لەلایەکی ترەوە سەری هەڵداوە[٢١]. پاش ئەوە نەصرانیەکان توانیان عەرەبی بێئاگا لەماهیەتی ئیسلام و عەرەبایەتی بۆ نێو بزوتنەوەی ناسیۆنالیستیەکەی عەرەبی بێنن بەهانەی ئەوەی کە ئیسلام رۆحی عەرەبایەتیە، عەرەب شایەنترن لەغەیرە عەرەب کە حوکمی دەوڵەتی خەلافەی ئیسلامی بکەن، چونکە هەر ئەوان بوون ئیسلامیان بە بەشەریەت ناساند. هەروەها وروژاندنی مەسەلەی بە مەوالی زانینی غەیرە عەرەب دەورێکی گرنگی بینی لە وروژاندنی بیری ناسیۆنالیستی عەرەبی لەسەر ئاستێکی فراوانتر. ئەم هۆکارانەش، دەرفەتێکی لەباریان بۆ (فۆرانس) رەخساند کە شۆرشێکی عەرەبی بە(شریف حسین) بکا، دژی دەسەڵاتی خەلافەتی ئیسلامی[٢٢]، هەروەها ئەو گروپە قەومیە روخاندنی حەتمی خەلافەیان بۆ ئینگلیز زۆر ئاسان کرد، هەروەها ژەنرال (لۆرد ئەلنبی) فەرماندەی سوپای عەرەبی لە دژی خەلافە دەڵێ: (ئەگەر یارمەتی سوپای عەرەبی‌و کرێکارە عەرەبەکان نەبوایە نەماندەتوانی سەرکەوتن بەسەر دوڵەتی عوسمانی بەدەست بێنین.[٢٣] سەبارەت بە ناسیۆنالیستی تورکیش ئەگەر دەستێکی شاراوە لەپشت ئەو بزوتنەوەیە نەبوایە ئەستەم بوو تورکی موسڵمان شۆرش دژی خەلافەتی ئیسلامی بکەن،چونکە لەلایەك هە

چۆن بێ دەسەلاّتی دەوڵەتی خەلافەی ئیسلامی بەدەست زۆرینەی تورك بوو، هەروەها تورکەکان تەواو درکیان بەوە کردبوو کە هەر شۆرشێکی قەومی دەبێتە هۆی لەدست دانی بەشێکی زۆری خاکی خەلافەتی ئیسلامی، بەواتایەکی تر ئیسلام بوو وای لەکورد و عەرەب و گەلانی دی نێو دەوڵەتی خەلافەتی ئیسلامی کرد بوو ، کە بەدەسەلاّتی عوسمانی رازی بن. بەنەمانی دەسەلاّتی رۆحیو سیاسی ئیسلامیش گەلانی غەیرە تورك رازی نابن ناسیۆنالیستی تورکی وەك بەدیلێك بۆ ئیسلام حوکمیان بکات. لەو روانگەوە دەبێ لە پێشینەو بزوێنەری ناسیۆنالیستی تورکی بکۆڵینەوە.هەر لەو پێوەدانگەوە گروپی جولەکەکانی دۆنمە و پاریس بزوێنەرو مونەزەری ناسیۆنالیستی تورك بوون، بە راسپاردەی ئەوان گروپی ئیتحادو تەرەقی یەکەم هەنگاوی ئینقلابە فکریو عەسکەریەکەیان لە (سلانیك) دەست پێکرد[24]، هەر جولەکەش بوون کە هانی گروپی رکابەری(عبد الحمید)یاندا کەداوای مەشروتیەت و کارپێ کردنی دەستوری عوسمانی بکەن. بەحوکمی ئەوەی عبد الحمید بەهیچ جۆرێك تەسلیم بەجولەکەکان نەبوو، هەر بۆیە جولەکەکان لە رێگای ئیتحاد وتەرەقی دەورێکی گرنگیان بینی لەبەدناو کردن و شێواندنی هەڵوێستی ئیسلامیانەی عبد الحمید . بە واتای لەدەستپێکی ئینقلابەکەدا، ئیتحادیەکان تەواو ئامانج قەومی خۆیان دەرنەخست، بەڵکو بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە عبد الحمید ئاستەنگ و لەمپەرە لەپێش بەرەو پێشبردنی دەوڵەتی عوسمانی، هەروەها هەروەك هەر گروپێکی دی ناسیۆنالیستی لەقۆناغی بەناو رزگاری نیشتمانیدا، بانگەشەی ئازادی گەلانی غەیرە تورکیشیان دەکرد، هەر بۆیە کەسانی وەك (د.عبداللە جودت) و(د.اسحاق سکۆتی دیاربەکر) ئەندامی کارای دامەزرێنەری باڵێکی ئیتحادو تەرەقی بوون[25]. بەلاّم سەرانی ئیتحاد و تەرەقی کە جولەکە ئاراستەی دەکردن بەرگری ئازادی گەلان و مانەوەی عبد الحمیدیان نەگرت، هەر بۆیە چەند مانگێك پاش

ئینقلابەکەیان بڕیاری لابردنی عبد الحمید یان دا. ئەوەی تەواو ماهیەتی ئیتحادو تەرەقی دەردەخا ئەوەیە کەبڕیاری لابردنی عبد الحمید بە(قەرەسۆی جولەکە)و(ئارام ئەفەندی ئەرمەنی)و( ئەرنائوتی گوبگائی حیکمەتە فندی کەرەجی) سپێردرا [٣٦]. ئەوەی لێرەدا شایانی باس بێ قەرەسۆی جولەکە لەبارەی دەوری جولەکە لە ئینقلابەکەی ئیتحاد و تەرەقی لەدژی عبد الحمید دەڵێ( عبد الحمید رازی نەبوو بە(پێنج ملیۆن) دان بە بوونماندا بنێ، مافی ئەوەمان بداتێ موستعمەرەیەك لەفەلەستین دروست بکەین، کەچی ئیتحادیەکان ئەو داوایەیان بە(چوارسەد هەزار) لیرەی ئینگلیزی بۆ کردین[٣٧]. هەروەها بەبەڵگەی ئەوەی کەجولەکە لەپاڵ ناسیۆنالیستی تورکی دابوو، ئەم بەڵگەی خوارەوە ئەو راستییە دەردەخات کەلەسەر دەمی حوکمی ئیتحادیەکان کۆمەڵێکی بەرفراوان لە(مەحافل)ی یەهودی لەنێو دەوڵەتی عوسمانی دامەزراون: (محفل الهلال العثماني) لە ١٤ فبرایر ١٩١٠ لەبیروت دامەزراوە، (محفل الحرية والاعتدال) لە(١٧)ی یۆنیۆی ١٩١٠ لە زحلە دامەزراوە.(محفل الناصرة) و(الشمس المروة) لە(٢٩) مایو ١٩١٠ لەئەسکەندەریە دامەزراون. (محفل الكمال) لە ١٧ی یۆلیۆ ١٩١١ لە قاهیرە دامەزراوە، هەروەها هەردوو مەحفەلی(لافیدیلتە) و(نور الهدی) لەهەمان مێژوو لە قاهیرە دامەزراون. (محفل الوحدة العثمانية) لە٦ ئابی ١٩١٠ لە (حمص) دامەزراوە، (محفل الاتحاد الخلد) لە ١٩ ئابی ١٩١٠ لەقدس دامەزراوە. (محفل المعبد سليمان) ١٤ی دیسەمبەری ١٩١٠ هەر لەقدس دامەزراوە. (محفل مرج العيون العثماني) لە ١٠ ئاب لە(مرج العيون) دامەزراوە، (محفل الجبل) لە ١٧ فبرایر ١٩١١ لە بیروت دامەزراوە ٣٨).

بەم جۆرە هەردوو هێزی داگیرکەری( صلیبیو یەهودی) لەرێگای ناسیۆنالیستی تورکیو عەرەبی، توانیان عەقیدەو شەریعەتی ئیسلامی لەدەسەلاتی دەوڵەت دووربخەنەوە. پاش ئەو پرۆسەیە بەرژەوەندی صەلیبیو یەهودی وای خواست کە بەجارێك خەلافەی

ئیسلامی نەهێڵن. بەڵێ هەروەك چۆن (پاپا) لەپاش داگیرکردنی ئەندلوس دەستوری دا کەخاکی موسڵمانان بەسەر دوو دەوڵەتی ئیسپانیا و پورتغال دابەش بکرێت [39]. ، هەر بەهەمان شێوە، سەرکردە ماسۆنیەکانی جیهان وەك (کلیمانسۆ، لوئید ولسن) بڕیاریان دا کە میراتی دەوڵەتی خەلافەی ئیسلامی بخرێتە ژێر دەسەلاتی ئیستعماری ئینگلیزو فەرەنسیو ڕووسیو یەهودی [40] . لەپاش ئەو داگیرکردنە فکریو عەسکەرییە هەردوو ئیستعماری ئینگلیزیو فەرەنسی چەندەها کیانی قەومیان بۆ تورك و عەرەب دروست کرد، بۆ هەر کیانەو چەندەها کێشەی قەومیو مەزهەبیو سنووریان خوڵقاند، بۆ ئەوەی جارێکی تر بەئاسانی یەکێتی ئیسلام دروست نەبێتەوە. هەردوو تەیاری ناسیۆنالیستی عەرەبیو تورکیش هاوشان لەگەڵ ناسیۆنالیستی فارسی کران بە پارێزەری ئەو سنورە ئیمپریالیانە. ئەمەو وەنەبێ سەرانی ناسیۆنالیستی تورکیو عەرەبیو فارسی کۆك و تەبابن،بەلکو هەروەها قورئان واتەنی ﴿ لا يُقَاتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلا فِي قُرًى مُحَصَّنَةٍ أَوْ مِنْ وَرَاءِ جُدُرٍ بَأْسُهُمْ بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّى ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لا يَعْقِلُونَ﴾ سورە الحشر/الايە ١٤ هەریەك لەم بزوتنەوە ناسیۆنالیستانە وا پەروەردە کرابوون کە ئەو کیانەی

لەسەر حسێبی خاکی گەلانی تر بۆی دروست کراوە خاکی مەشروعی خۆیەتی، چونکە لەدوای جەنگدا هاوپەیمانەکان بەم جۆرە بڕیاریان لەسەر نەخشەی سیاسی جیهان داوە، هەربۆ نمونە تورکەکان نەك هەر دان بە سنووری کوردستانی باکووردا نانێن، بەڵکو نەفی بوونی نەتەوەی کوردیش دەکەن [42] ، هەرچی عەرەبە ناسیۆنالیستەکانی عێراقیش ئەوە وەك مەوالی تەماشای کورد دەکەن فارسەکانیش بەناوی ئەوەی فارس و کورد یەك رەگەزن دان بە ناسنامەی قەومی کورد نانێن! لەو نێوەندە دەتوانرێ تەواو دەرك بەکاریگەری ناسیۆنالیستی ڕۆژئاوا بکرێ لەسەر دیدو بۆچون هەتا رەفتاری

ناسیۆنالیستەکانی ڕۆژهەلأت. هەر یەك لەم سێ ناسیۆنالیستە بەسەپاندنی چەمک نەتەوەی گەورەو نەتەوەی بچووك بەشتێکی پیرۆز دەزانن هەر بۆیە (د.اسماعیل بێشکچی) دەڵێ: (نەتەوە پەرستی تورك و عەرەب و فارسەکان دوژمنکارن، سروشتی بزوتنەوە نەتەوەییەکانی تورك و عەرەب و فارس ناوەڕۆکێکی ئیمپریالیستی ئیستعماریان هەیە)[٤٣] . ڕۆژئاواش تەواو دانی بە شەرعیەتی داگیرکردنی کوردستان لەڕێگای ڕێککەوتننامەی نێو دەوڵەتی یەکان ناوە. وەك ڕێککەوتننامەی (سایکس - بیکۆ ١٩١٦)و(سان ریمۆ ١٩٢٠) و(لۆزان ١٩٢٣). هەر ئەو پرۆسە ئیستعماری یە دوو ڕەگەز هێڵێکی جیاکەرەوەی لە نێوان ویستی کوردو داگیرکەرانی دروست کردووە: لە دیدی کوردان پەیمانی سیڤەر ١٩٢٠ دان نان بوو بە بوونی قەومی کورد، کەچی هەمان پەیمان لە دیدی تورکە قەومی‌یەکانەوەلەسێدارەدانی تورکیای دەگەیاند[٤٤] . هەروەها کورد پەیمانی لۆزان تەواو بە کۆیلایەتی دادەنێت، کوردستان بەپێی ئەو ڕێکەوتننامەیە لە نێوان چەند دەوڵەتێکدا دابەش و پارچە پارچە کراو کوردیش دوچاری کۆیلەتی‌یەك کە کەلەهیچ شوێنێکی تر وێنەی نی‌یە، بەلأم ڕێکەوتنی لۆزان لای تورك مانایەکی تری هەیە لۆزان بۆ ئەوان سەربەخۆییو بنیادکردنەوە دەگەیەنێت[٤٥] .

# پەراوێزەکان

١-سورەتی المجادلە/٢٢.

٢-رواه البخاری.

٣-رۆژنامەی مافناس ژ:١،١٩٩١.

٤-گۆڤاری کادر ژ:٢٨، ١٩٩٢ لا ٧٨.

٥-ئازاد مستەفا، نەتەوەو نەتەوایەتی.

٦-محمد قطب، مذاهب فکریة معاصرة، ص٥٥٤.

٧-گۆڤاری کادر ژ: ٢٨، لا١٦٧.

٨-محمد قطب، مذاهب فکریة معاصرة،ص٥٦٠.

٩-سەرچاوەی پێشوو.

١٠-أبو الحسن الندوی، ماذا حسر العالم بانحطاط المسلمین، ص٢١٢.

١١-محمد، مذاهب فکریة معاصرة، ٥٦٦.

١٢-مامۆستا هیوا: گوڤاری ئالآی ئیسلام ژ:٢،١٩٩٣.

١٣-برهان قانع، فەرهەنگی نوێ.

١٤-د. جمال نەبەز، بیری نەتەوەیی کورد نەبیری قەومی رۆژهەلآتییەو نەبیری ناسیۆنالیستی رۆژئاواییيە.

١٥-گۆڤاری ئالآی ئیسلام ژ:٢،٣-١٩٩٥.

١٦-The penguin Book of English Verse

١٧-محمد قطب، محاضرة صوتیة: أضواء علی تاریخنا المعاصر.

١٨-مصطفی خورانی، الانقلاب العثماني

١٩-محمد قطب، محاضرة صوتیة: أضواء علی تاریخنا المعاصر.

٢٠-موفق بني المرجة، صحوة الرجل المريض...ص:أ

٢١-موفق بني المرجة، صحوة الرجل المريض ... ص:أ

٢٢-ئەو جولەكانە خۆيان وا پيشان دەدا كە موسوڵمانن، ئەوانە لەئيسپانياوە بۆ ناوچەى سلانيك هاتوون.

٢٣-محمد قطب، مذاهب فكرية معاصرة، ص٥٨١.

٢٤-سەبارەت بەو خاڵە لە نوسينێك بەناوى(انقلابەكەى ١٩٠٨) كە بەئەڵقە لە سێ ژمارەى برايەتى رۆژانى ١٧و ٢٢و ٢٤ى كانوونى دووەمى ١٩٩٤ بەدرێژى باسى ئەو خاڵەم كردووە. (بڕوانە بەشى‌دووەم).

٢٥-أثر الأقلية اليهودية في سياسة الدولة العثمانية تجاه فلسطين،ص١.

٢٦-هيوا سەلام، ئەو هۆكارانەى دژى كورد دەشێوێنن، گۆڤارى مەتين ژمارە: ٦٠.

٢٧-پاش ئەوەى سلێمان قانونى، رۆكزيلانى يەهودى خواست و كردىيە (حرم السلطان) يەكەم پێشێلى شەريعەتى ئيسلامى دەستى پێكرد، رۆكزيلان توانى وا لە سوڵتان بكا رازى بێ بە رێككەوتننامەى (الامتيازات الاجنبية في الدولة العثمانية) لەگەڵ فەرەنسواى يەكەمى مەليكى فەرەنسا. هەروەها هەر لەرێگاى رۆكزيلانەوە(سلێمان) رازى بوو كە جولەكەكانى رووسياو ئەندەلوس بۆ نێو خاكى خەلافە بێن، لەپاشان هەر ئەو جولەكانەش بوون دەوڵەتى عوسمانيان لەنێو برد. سەيرى: موفق بني المرجة، صحوة الرجل المريض، ص٢٢٨بكە .

٢٨-آل عمران – ١٣٩.

٢٩-الأنعام – ١٥٣.

٣٠- محمد قطب مذاهب فكرية معاصرة ص٥٨١.

٣١- گۆڤاری بانگی هەق ژ (١) لا٠١.

٣٢-موفق بن المرجة،ص٢٧١.

٣٣-محمد قطب/مذاهب....،ص٥٨٣.

٣٤-خوراني، أسرار الانقلاب العثماني.

٣٥-زنا سلوبي، في سبيل كوردستان (مذكرات) ص٢٤.

٣٦-خوراني، اسرار الانقلاب العثماني.

٣٧-موفق بني المرجة، صحوة الرجل المريض، ص٢٢٨.

٣٨- سەرچاوەی پێشوو،ص٢٣٢.

٣٩-محمد قطب، مذاهب ...،ص٥٦٧.

٤٠- تەماشای بەشی چوارەم بكە.

٤١-الحشر - ١٤.

٤٢-ئینونو دەڵێ: من هەستی خۆم ناشارمەوە دەڵێم تورك خوای گەورەی ئەم وڵاتەیە ئەوانەی كە بەرەگەز تورك نین هیچ مافێكیان نیی تەنیا ئەو مافە نەبێ كە نۆكەرو عەبدی تورك بن.(ژەنرال جەمال گورسلی) فەرماندەی كودەتاكەی ئایاری١٩٦٠ دەڵێ: هیچ نەوەیەك نیە لەتوركیا كەناسنامەیەكی نەتەویی جیا لە توركی هەبێو بەخۆ بڵێ كورد.

٤٣-ئیسماعیل پێشكچی، كوردو مەسەلەی كورد،ل٤٥

٤٤-سەلام، دۆزی كورد لە نێوان دا چوون و هەڵچوونێكی ناكۆك ل٥٢.

٤٥-ئیسماعیل پێشكچی، كوردو مەسەلەی كورد، ل٢٦- ٢٧.

# سەرچاوە سەرەکی‌یەکان

## کتێبەکان


١-ئازاد مستەفا، نەتەوەو نەتەوایەتی،چ٢،١٩٩٢.

٢-ابو الحسن علي الحسن الندوي،ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين، دار الصفاء ١٩٩٠.

٣-اسماعیل پێشکچی،کوردو مەسەلەی کورد، سلێمانی١٩٩١.

٤-جەمال نەبەز،بیری نەتەوەیی کوردنەبیری قەومی رۆژهەلاتی‌یە و نەبیری ناسیۆنالیزمی‌رۆژئاوایی‌یە،سوید ١٩٨٤.

٥-محمد قطب، مذاهب فكرية..، دار الكتاب الاسلامي(؟)

٦- مصطفى خوراني، اسرار الانقلاب العثماني، تونس١٩٧٨.

٧- موفق بني المرجة، صحوة الرجل المريض او السلطان عبد الحميد الثانيوالخلافة الاسلامية ١٩٨٤

٨- زنا سلوبي، في سبيل كوردستان (مذكرات) بيروت ١٩٨٧


## گۆڤارەکان


١-گۆڤاری ئاڵای ئیسلام، چاپی کوردستان و چاپی دەرەوە

٢-گۆڤاری بانگی هەق

گۆڤاری مەتین

## ١-کودەتاکە چۆن سەری هەڵدا؟

بەپێی ڕێککەوتننامەی چالدێران ١٥١٦ نێوان سوڵتان سەلیمی عوسمانی‌و مەلا ئیدریس، میرەکانی کورد لەقەڵەمڕەوی عوسمانی دا جۆرە سەربەخۆیەکی نێو خۆیان بۆ دابین کرابوو، بەڵام دەمێك سوڵتان مەحمودی دووەم ١٨٠٨ - ١٨٣٩ جڵەوی حوکمی گرتە دەست لەو بەڵێنە پەشیمان بۆوە.

سوڵتان مەحمود دەیەویست دەوڵەتێکی عوسمانی لەسەر شێوازی ڕۆژئاوا دابمەزرێنێ‌و(لامەرکەزیەتی) هەرێمە کوردیەکان هەڵبوەشێنێتەوەو حوکمی دەسەلاتی ناوەندی بەسەر هەرێمەکاندا بسەپێنێت. ئەو کردارە نا عادیلانەی سوڵتان مەحمود زەمینەیەکی ڕەخساند بۆ دەست تێوەردانی ئەورووپی لەکاروباریئیمپراتۆریەتەدا بەجۆرێك ئەو مافی دەست تێوەردانە لەپەیمانی ئەرزەرۆم ١٨٢٩ شەکلێکی ڕەسمی وەرگرت. لەسەردەمی سوڵتان عبدالعزیز ١٨٦١ –١٨٧٦ کرداری سەپاندنی دەسەلاتی ناوەندی بەسەر هەرێمەکاندا گەیشتبووە ڕادەیەکی ئەوتۆ تاکو ڕکابەری تورکیش بەرەبەرە لەنێو ڕۆشنبیران و سوپای عوسمانی‌دا بەدەرکەوتن.

ئیمپراتۆریەتیش دوچاری قەیرانێکی سیاسی‌و ئابووری وا ببو هەڕەشەی لەمانەوەی سوڵتانەکان دەکرد. بەجۆرێك ئەو دەمەی عبد الحمید چووە سەر کورسی دەسەلات، دەوڵەت ٢٥٢٨–١٨٨٥ لیرەی عوسمانی قەرزاربوو، لەو لاوەش هەریەکە لەئینگلیزو رووسیا لەململانێیەکی بەردەوام بوون لەسەر شوێن پێ توند کردنیان لەو ئیمپراتۆریەتەدا. لەژێر فشاری دەسەلاتی ئەورووپی بەتایبەت لەنێو گروپە فکری‌یەکەی پاریس، مەدحەت پاشا وەك ڕفۆرمیستێك وەدەرکەوت.لەساڵی١٨٧٦ دەستورێکی داناو ناوی لێنا دەستوری عوسمانی‌و بانگەشەی (دادگەریو یەکسانی‌و برایەیی) لەنێو گەلانی ئیمپراتۆریەت دەکرد. لایەنگرانی مەدحەت پاشا داوایان لە سوڵتان عبد الحمید

١٨٧٦- ١٩٠٩ کرد کە بەگوێرەی دەستوری عوسمانی کاروباری وڵات بەڕێوە بیات. بەڵام سوڵتان نەك هەر پەیڕەوی ئەو دەستورە عوسمانیەی نەکرد، بەڵکو هەوڵیدا لایەنگرانی دەستورەکەش دەست بەسەردا بگرێت، لەئاکامی ئەو هەڵوێستەی عبد الحمید لەناوەوەو دەرەوەی ئیمپراتۆریەت بەرەی رکابەری سەری هەڵدا.

رێکخراوی سەرەکی ئەو بەرەی رکابەرییە رێکخراوی(ئیتحادو تەرەقی) بوو، ئەو رێکخراوە هەر لەسەردەمی عبدالعزیز ١٨٦١- ١٨٧٦ وەك رێکخراوێکی رۆشنبیری لەدایك ببو، لە تەموزی ١٨٦٥ رێکخراوەکە یەکەم کۆنگرەی(کۆنگرەی دامەزراندنی) بەستووە. بەلأم لەسەردەمی فەرمانڕەوایی عبد الحمید قاڵبێکی سیاسی وەرگرت. لەساڵی ١٨٨٩ دکتۆر(عبدالله جودت) لەگەڵ سێ هاوڕێیانی کە: ئیسحاق سکوتی دیاریەکریو ئیبراهیم تەموی ئاماوت و مەحمود رەشیدچەرکەزی بوون، رێکخراوێکی سیاسیان بەناوی(یەکێتی عوسمانلی) بە نهێنی پێکهێناوە هەر ئەو رێکخراوە سیاسییە دوایی بوو بەکۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی [3]. لەلایەکی دی لەئابی ١٨٩٩ تەلعەت پاشا کە نامەبەری پۆستە بوو، لەگەڵ حەوت لەهاوڕێیانی یەکەم شانەی (کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی) لەسالانیك دامەزراند [4]، لەدەرەوەی ئیمپراتۆریەتیش ئەو بەرە رکابەرییەی لەپاریس گیرسابوونەوە بەهاوکاری ماددیو مەعنەوی ناسیۆنالیستە فەرەنسییەکان و جولەکەکانی دژ بە عبد الحمید رێکخراوێکی سیاسیان بەناوی (ژوون تورکەکان- تورکە لاوەکان) دامەزراند. هەردوو بەرەی رکابەری عوسمانلی، دەرەوەو ناوەوە، دوو کۆنگرەی گشتیان گرێدا، جەختیان لەسەر روخاندنی دەسەلأتی عبد الحمیدو دامەزراندنی حکومەتێکی دەستوری لە ئیمپراتۆریەت کرد. کۆنگرەی یەکەم لەساڵی ١٩٠٢ ئەوی تر لەساڵی ١٩٠٧ بووە. بەمجۆرە لەکۆتایی ئەیلولی ١٩٠٧ بەرەی رکابەری عوسمانلی مژۆڵی داڕشتنی بەرنامەیەکی سیاسیو عەسکەری بوون بۆئەوەی ئینقلابێك دژی عبد الحمید ساز بدەن [5]. لە ٢٧ی

ئەیلولی ۱۹۰۷ ئەحمەد رەزا بەگیش باڵی چەپی ئیتحادییەکان لەگەڵ سزائی بەگ دۆسیەی پەیمانێکی دووقۆڵیان مۆرکرد. بەپێی پەیمانەکەیانی ئەو بڕیارە دەبوو (کۆمەڵەی عوسمانلی، تەرەقیو ئیتحاد) کەلەپاریس بووە، کۆمەڵەی (عوسمانلی حوریەت) کەبنکەکەی لە سلانیك بوو، یەکبخرێن و کۆمەڵەیەکی تازە بەناوی کۆمەڵەی (عوسمانلی تەرەقیو ئیتحاد) دامەزرێنن [٦] . ئامانجی ستراتیژی ئەو کۆمەڵە تازەیە، روخاندنی حوکمی تاکڕەوی عبد الحمیدو کارکردن بەپێی دەستوری عوسمانلی(مەدحەت پاشا) بوو. سلانیك بنکەی رکابەری کۆمەڵە بوو، هەربۆیە سەرانی کۆمەڵە سلانیکیان کردە خاڵی بەرایی راپەڕینەکەیان. سەرکردەی سوپایی وەك(ئەنوەر پاشا)،(نیازی پاشا) هەرایەکی گەورەیان لە سلانیك نایەوەو لە ماوەیەکی کورتدا ئیتحادییەکان دەستیان بەسەر تەواوی دامودەزگای دەوڵەت داگرت.

سەرکردە سوپاییەکانی هەرێمەکەش بەگەرمی پێشوازی ئەو راپەرینەیان کرد، هەروەك حسین حلمی پاشا، پێشکەنەری گشتی سوپای عوسمانی، ئەو راستیە بۆ عبد الحمید دەگێڕێتەوە (بێجگە لەمن هەموو ئەفسەرەکانی ئەوێ بوونەتە لایەنگری کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی) [٧] . عبد الحمید دەیویست بەهەرجۆرێك بێت ئیتحادیەکان دەمکوت بکا، بەلاّم هەروەك لە کۆبونەوەی ۹ی تەموزی ۱۹۰۸ ی ئەنجومەنی وەزیران دەردەکەوێت – ناکۆکی پەشێوی هۆڵی ئەنجومەنیشی گرتبۆوە– رەزا پاشا فەرماندەی لەشکری عوسمانی، بەرگری لەداخوازیەکانی ئازادی ویستەکان – ئیتحادیەکان – دەکرد، بەلاّم ئیسماعیل پاشا هەڕەشەی دەمکوتکردنی – ئیتحادیەکان– ی دەکرد [٨] . ئەوشەوە، واتە شەوی ۹/۱۰ی تەموز تەواوی ئیمپراتۆریەت لەلایەك و ئەستەمبوڵیەکان بەتایبەتی چاوەڕێی بڕیاری کۆتایی عبد الحمید بوون. رۆژنامەکان لەکاتی دیاری کراوی خۆیان دەرنەچون، پەیتا پەیتا پەشێوی ئەستەمبولیشی تەنیەوە، لەپاشان عبد الحمید بڕیاریدا

کەهێمنی و ئاسایشی ولآت بپارێزێ. بەلآم ئەو بڕیارەی عبد الحمید هەر قسەیەکی رووت دەرچوو - چونکە لە سپێدەی رۆژی هەینی دەی تەموزی ۱۹۰۸ شاری ئەستەمبوڵ خۆپیشاندانێکی جەماوەری بە خۆوە بینی. راپەڕیوەکان هەرسێ دروشمە مەرکەزیەکەی ئیتحادو تەرەقی ( دادگەری ، یەکسانی، برایەتی ) یان بەرز کردبۆوە [۹] . رۆژی شەممە ۱۱ی تەموز، رۆژنامەکان ئیستیقالەکردنی وەزارەتی فەرید پاشاو دامەزراندنی وەزارەتی سەعید پاشایان بلآوکردەوە، سەعید پاشا دەست بەجێ بڕیاری - لێبوردنی گشتی- دەرکرد ، ئیمپراتۆریەت لە نێو گەردەلولی ئاشوب و پەشێوی دا دەتلایەوە- عبد الحمید رۆژی هەینی ٢٤ ی تەموز بڕیاریدا کە بەدەستوری عوسمانی ۱۸۷٦ بکات. بەلآم کالەکار ترازابوو. دەستور هەر دەستوری ئیتحادیەکان بوو. دوای ئەم کودەتایەش، عبد الحمید وەك - خەلیفەیەك - هەر لەسەر حوکم بوو، بەلآم مانەوەی هەڕەشەی لە دەسەلآتی ئیتحادیەکان دەکرد، هەر بۆیە بۆ ئەوەی پیلانی کودەتاکە بەتەواوی جێ بەجێ بکرێ، ٢٤٠ ئەندامی ئەنجومەنی پیران لە ٢٧ نیسانی ۱۹۰۹ دا بە تێکڕای دەنگ بڕیاری لەسەر لابردنی عبد الحمید داو، ئەنجومەنی مەبعوسانیش بڕیارەکەی جێبەجێ کردو- وەفدێکی(٤) کەسی پێکهات لە ئارام ئەفندی ئەرمەنیو حکمەت پاشا ئەفسەری دەریا و عمانویل قەرەسوی یەهودی نوێنەری سلانیك و ئەسعەد توبتانی ئەلبانی- بۆ ئەوەی دەقی بەیانەکە بدەنە عبد الحمید [۱۰] .دوای لابردنی عبد الحمید ئیتحادیەکان دەستیان بەسەر تەواوی دامو دەزگای دەوڵەت داگرت محمد رشادیشیان کردە خەلیفەیەکی گوێ ڕایەڵی خۆیان.

## ١- ئایدۆلۆژی و ستراتیژیەتی ئینقیلابیەکان

ئایدۆلۆژی سیاسی ئیتحادیەکان لەسەرەتاوە، شاراوە بوو بە واتای نە ئایدۆلۆژیەکی نەتەوەیی-تورکی- ونە نەئایدۆلۆژیەکی نێو نەتەوەیی-ئیسلامی- بوو. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆی سەرەکی:-

یەکەمیان:- رێخراوەکە زۆربەی گەلانی نێو ئیمپراتۆریەتی وەك تورك و کورد، عەرەب، چەرکەس، ئەرمەنی، جولەکە، لەخۆگرت کردبوّوە، هەر بۆیە دژوار بوو بزوتنەوەکە کە شکلێکی ناسیۆنالیستی رووت وەربگرێت.

دووەمیان:- دەسەلاتی مەرکەزی رێکخراوەکە زیاتر لەژێر دەستی دەسەلاتی عەلمانیەکان و نەتەوە غەیرە موسڵمانەکان دا بوو، لێرەش ئەستەم بوو رێکخراوەکە مۆرکێکی ئیسلامی بە خۆوە بگرێت - لەو پێوەدانگەوە دەتوانین جەخت لەسەر ئەوە بکەین کە حکومەتە کەی ئینقیلابیەکان - حکومەتێکی ئیسلامی دەوڵەتیو ناسیۆنالیستی هاورد - و بوو بەشێوازێکی تر دوو گروپی سەرەکی ئەو رێکخراوە دیار بکەین باڵی پان-عوسمانیزم و پان- تورکیزم. گروپی یەکەم دەیانویست دەوڵەتی عوسمانی بگۆڕن بە دەوڵەتێکی فیدراڵی هەموو گەلانی نێو ئیمپراتۆریەت لە حکومەتی بەشداربن هەرسێ دروشمە مەرکەزیەکەی ئیتحادیەکان (دادگەری، یەکسانی، برایەتی) بێ گوێدانە جیاوازی ئاین و مەزهەبینەتەوایەتی لە حکومەتەکەدا بەرجەستە بکەن، رابەری ئەو تەرزە بیرە دکتۆر عبدالله جودت ی بەنەژاد کورد بوو. هەروەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، (د.عبدالله جودت) یەکەم شانەی ئیتحادی پێکهێنابوو. هەرچەندە د.عبدالله کورد بوو، بەلام بیرە ئومەمیەکەی بانگەشەی دەوڵەتێکی عوسمانی یەکگرتووی لێدەکرد ، د.عبد الله جودت هەم هیمدادی فیکریو هەم هیمدادی سیاسی تورکە لاوەکان و ئیتحادو تەرەقی بوو- هەروەها باوکی فکری مستەفا کەمالی سەرۆکی تورکیای نوێ بووە "لە نێوبەرەی پان

وسمانیزم ناکۆکیەکی ئـایدۆلۆژی بنجـی داکوتـابوو. هـەندێ وەك د.عبـدالله جـودت دژە ئیسلابوون بانگەشەی دوور خستنەوەی ئاینیان لە دەوڵـەت دەکـردو دەیانویسـت ئـاین - ئیسلام- جێ بـۆ ماتریالستی بیۆلـۆژی چـۆڵ بکا. بـەبڕوای پرۆفیسۆرشـەریف مـاردینی نوسەری سیاسی ژون تورکەکان، عبدالله جودت لەپێشەوەی ئـەو کەسـانە بـوە کـە بـیری ماتریالیستی نامۆ بەواقعی گەلانی ئیمپراتۆریەتی بڵاوکردۆتەوە هەروەك لـە نوسینەکەیدا دەنوسێ: لەو لێکۆڵینەوەمدا کە بەتایبەتی لەسەر کەسێك کە فکرەی لەهەر کەسێکی دی بـەرچاوترە، ورد دەبمـەوە، کـاتێك مـرۆڤ لـەفکرەکانی د.عبـدالله جـودت ورد دەبێتـەوە هەنگی مۆ دەبینێ کە بیرو باوەڕی رۆژ ئاوایی- ماتریالیست، تۆرگانیسـت، داروینیسـت- چۆن تاسیری لەبیرو باوەری ئێمە کردووە. کەسانێکی وەك مرادبەگیش کـە بـاڵی راسـتی ئیتحاد دادەنرا، لەگەڵ کۆمەڵەکەی، کە هەموو بەرەگەز تـورك نـەبوون وەك جمـال بـەگی مێژوونووس، سلێمان نەزیف، اسماعیل حقی دیاربەکری.... داوای دەوڵـەتێکی عوسمـانی یەکگرتوویان دەکـرد بـەڵام ئیسـلام، ئـاینی ئـەو دەوڵەتـە بێـت. گروپـی دووەم، نەتـەوە پەرستی توندڕەوی وەك ئەحمـەد رەزای نوێنـەری بـاڵی چـەپی کۆمەڵـە، دوژمـن بـاوە کوشتەی ئیسلام و تەلعەت بەگی نوێنەری مەدەنیـە روونـاك بیرەکـانی تـورك و ئـەنوەر بەگ و جمال بەگی خوێنرێژی نوێنەری عەسکەریەکانی لەخۆ گرد کردبۆوە. ئەو دەستەیە کـە دینـەمۆی ئـایدۆلۆژی سـەرەکیو سـتراتیژیەتی دووری ژون - تورکـەکان بـوون دەیانوت:- ئێمە تورکین قیبلەی ئێمە تۆرانـە- یوسـف ئـاقچۆرا ئـەندامی بـەرەی پـان- تورکیزم، هـەر زوو کەوتـە رەتکردنـەوەی فکـرەی پـان- عوسمـانیزم و جـەختی لەسـەر دەوڵـەتێکی ناسیۆنالیسـتی تورکـی دەکـرد. ئـاقچۆرا ئـەو بۆچوونـەی لـە گۆڤـاری(تـورك یوردی) لـە وتـارێکدا بـە نـاوی - زیندوبوونـەوە دوای مـەرگ هەقـە- بڵاوکردۆتـەوە- تورکەکان دەبێ لەعەرەبەکان جیاببنەوە-!

هەرچەندی زوو ئەو کرداره مەیسەر بکرێ هێندە زوو تورکەکان دەتوان
دەوڵەتی عوسمانی بە دەوڵەتێکی تورکی بگۆڕن [12] سەرانی ئەو بیرە نەتەوەیی‌یە هەر ب
تورکی کردنی دەوڵەتی عوسمانی نەوەستان بەڵکو دەیانویست هەموو ئەو گەلانە
بەرەگەز تۆرانین لەدەوڵەتێکی رەگەزیی کۆبکرێتەوە؟؟ زارەڤەند لە کتێبی -ئەفسانە
پان - تۆرانیزم- بە پوختی گەلانی رەگەز تۆرانیمان بۆ دەنوسێت:تورکەکانی عوسمان
دانیشتووی ئەستانەو ئەنادۆل و تەتەرەکانی قەوقازو ناوەندو خوارووی رووسیا، تورك
تورکمانەکانی، ئۆزبەك- مەگۆل مەنجو تونگوزارەکانی ناوەراستی ئاسیا، دانیشتوا
رەسەنەکانی سیبریاو هە فلەندەکانی فنلاندو دەوڵەتەکانی بەلتیك و لەدوایشدا هەنگاری
بلگاری هەموویان بەرەسەن تۆرانین [13] ناسیۆنالیستە تورکەکان دەیانویست جارێ
هەموو ئەو گەلانەی بە تورکی قسەدەکەن، وەك تورکەکانی عوسمانی، تورك زمانەکان
ئازەربێجان، تورکەکانی رووسیاو چینی گەلێر لە یەك دەوڵەت کۆبکەنەوە، ژون تورک
ناسیۆنالیستەکان هەر ساڵێك دوای ئینقلابەکەی تەموزی ١٩٠٨ هەقیقەتی خۆیا
بەدەرخست، بەجۆرێك کەوتنە راونان و تیرۆرکردنی سەرانی پان- عوسمانیزم
بزوتنەوە نەتەوەیی‌یە غەیرە تورکەکان. بە جۆرێك دوای شەرەکانی بەلتیکی ١٩١٠
١٩١٢،١٩١٣ جیابوونەوەی گەلە غەیرە موسوڵمانەکان بەتایبەتی یۆنانیەکان
مەکدۆنیەکان و هەروەها ئەلبانیەکان و بەجارێك شۆفینزمی تورکی تیژ کرد. لەو نێو
گەلی کورد و ئەرمەن دڕندەترین شێوەی تیرۆرو چەوساندنەوەی نەتەوەییان لەو کردار
توندەی تورکەکان بەرکەوت، بەمجۆرە ناسیۆنالیستی تورك دەیویست لەسەر حسێبم
گەلان دەوڵەتێکی سەد لەسەدی تورکی دابمەزرێنێت. ئەو فکرەیەی ئیتحادیەکان ل
رووی رێکخستن و ستراتیژەوە زۆر کۆمەڵەی کاربوناری ئیتالی دەچوو، کە خەباتی دەکرد
لە پێناوی دەرکردنی فەرەنسی‌و نەمساویەکان لە نیمچە دورگەی ئیتالیا، ئەمەش

راستیەکی رەهایــە کــە ناسیۆنالیســتی تورکــی پابــەندی ناسیۆنالیســتی فەرەنســیو جولەکەیی بووەو، بەجۆرێك جولەکەیەکی وەك لوملی ئینگلیز دەیگـوت: رەگـەزی تـورك، کە تورانیە لەرەگەزی هەموو گەلانی تری رۆژئـاوا چاکـترە [١٤] ، ئـەو تێروانینـە رەگەزیـە وای لـە زیـاد ئـالپی بەرەگـەز کـورد کـرد کـرداری بـەتورکی کردنـی کـوردو کوردسـتان، بـەکردارێکی شارسـتانیو زەروری بزانێـت [١٥]. هـەروەها بـەگوێرەی قسـەکانی پرۆفیسـۆر خدوریو (برنارد لویس دەیڤد کۆهینی )فەرەنسی بوو، بیری تۆرانی لە نێو گروپی تورکـە لاوەکاندا بلاوکردۆتەوە.

ئەو بۆچونەش تەواو لەگـەڵ سەرهەڵدانی ژون تورکـەکان کـە پـاریس و سـلانیك بوو، یەك دەگرێتەوە لەلایەکی تریش (ئەدی عەمانوئیل قەرەسوی) نوێنـەری سـلانیك لـە ئەنجومەنی مەبعوسان یەکێك لـەو چـوار وەفـدە نـەبوو کـە بڕیـاری لابردنـی عبـد الحمیـد خەلیفەیان بە عبد الحمیـد راگـەیاند؟! هـەروەها بەڵگـەی دی لەسـەر ئـەوە کـە هۆکـاری دەرەوە دەوری گرنگی خۆی بینیوە لە فیکری ئینقیلابەکەی تحادیەکان دەگەڕێتـەوە بـۆ لەیـــەکچوونی بـــیرو ســـتراتیژیەتی ناسیۆنالیســـتە تورکـــەکان و، میلیتاریســـتە ئەڵمانەکان(لەسەدەی نۆزدەی زاییندا میلیتاریسـتە پـەریوزەکان لـەرێگای بـەکارهێنانی سـوپاوە توانیـان دەوڵـەتی ئـەڵمانی دابمـەزرێنن ئـەوەش دەورێکـی گرنگـی گـێڕا لـە بیرکردنـەوەی ژون تورکـەکان بەتایبـەتی، چونکـە ئەڵمانـەکان لەسـەدەی نـۆزدە پەیوەندیەکی سوپاییو بازرگانی زۆر توندو تۆڵیان هەبوو لەگەڵ دەوڵـەتی عوسمـانی [١٦] ، کودەتاکـەی ١٩٠٨ ی ئیتحادیـەکان لاسـایی کردنەوەیـەکی ئـەو هەوڵـەی ئەڵمانـەکان بـوو.(زارفـەند) کاریگـەری هـەردوو شۆرشـی رووسـیش دەکاتـە هۆکـارێکی دی بـۆ بلاوبوونەوەی بیری تۆرانیزم و دامەزراندنی دەوڵەتێکی ناسیۆنالی تورکی:

(دەسەلاتی رووسەكان بۆ ماوەیەكی كەم، ئەو بوركانی تورانیەتی خامۆش كرد، نەژادی سلاڤی بەسەردا زالّ كردن، ئەمما ئەمڕۆ لەنێو ئەو كلاوڕۆژنەو كەلێنانەی دوو شۆرشی رووسیا كردویەتیەوە، گرمەی بوركانی تۆرانی لەهەموو كاتێك توندترو ترسناكتر دێتە بەر گوێ، دیواری نێوان تورك و تەتەر درز دەباو هەموویان لەدەوری بەهێزترین و ئاپۆرەترین ولاتیان كە توركیایە كۆدەبنەوە [17]).تۆرانیزم و ستراتیژیەتی ئیستعمارانەی ئیتحادیەكان لەسەر دەستی كەمالیەكان، بوو بەدڕندەترین شێوازی ئایدۆلۆژی توندڕەوو شوێنی لەجیهاندا.

## ٢- ئینقیلابەكەو بزووتنەوەی سیاسی كورد

ئەو بارو دۆخە نوێیەی لەئاكامی ئینقلابەكەوە هاتە كایەوە زەمینەیەكی لە بەردەم روناكبیرانی كورد رەخساند بۆ ئەوەی ئەو دەرفەتە بقۆزنەوەو دەوری خۆیان لەحكومەتە (دەستوری) یەكەی ئیتحادیەكان ببینن. لە سالّی یەكەمی حكومەتەكەدا، كە هێشتا عبد الحمید لەسەر كاربوو، ململانێی بالّی مەدەنیو عەسكەری حكومەتەكە لە كایە بوو، حكومەت تەواو جێ پێی خۆی توند نەكردبوو، جۆرە ئازادیەك و مافی رادەبڕین لەئارابوو. هەر بۆیە(شێخ عبدالقادری عوبیدەللای شەمزینی لەگەلّ ئەمین ئالی بەدرخان لە ٢٥ی ئەیلولی ١٩٠٨ یەكەم رێكخراوی سیاسی كوردیان بە نێو -كۆمەڵەی بەرزێتیو پێشكەوتنی كوردستان- یان دامەزراند [18] ئەو گروپە بۆئەوەی بیرو بۆچوونی خۆیان لەنێو خەلّكدا بلاّوبكەنەوە لە ٩ی تشرینی دووەمی هەمان سالّدا رۆژنامە (كورد) یان دەركرد. رۆژنامەكە بە گوتەی ئەمڕۆ زمانحالّی كۆمەڵەكە بوو گەلێك وتاری لەسەر وشیاری نەتەوەیی بلاّوكردەوە -لەو لاوەشێخ سەعیدی نەورەسی بۆ ئەوەی پەردە لەسەر هەقیقەتی ئیتحادیەكان هەلّداتەوە -كۆمەڵەی یەكێتی موحەمەدی - پێكهێنابوو

هـەمان دروشمـــە مەركەزیـــەكانی ئیتحـــادو تـــەرەقی (دادگـــەری، یەكســـانی، برایـــەتی) بەرزكردنەوەو بەجیدی داوای یەكێتی عوسمانی لەژێر ئـالآی ئیسـلام دەركـرد لـە پێنـاوی بوژاندنەوەی ئەدەب و فۆلكلۆرو داب و نـەریتی رەسـەنی كـورد كۆمـەڵێكی وێژەییـان بـە نێـوی - كۆمەڵـەی بڵاوكردنـەوەی زانیـاری كـورد- لـە چەنبـەرلی تـاش دامـــەزراند. مـیر عبدولرەزاقـی نـەوەی بـەدرخانیش قوتابخانەیـەكی كـوردی لـە ئەسـتەمبولٌ بـە نـاوی قوتابخانـەی (دەستوری) كـردەوە، بـەڵام ئـەو بـارو دۆخـە زۆری نـەخایاند هەقیقـەتی شۆڤینیە توركەكان بۆ گەلانی غەیرە تورك بە دەركەوت: هەموو رێكخراوە سیاسـیو یانـە رۆشنبیریو قوتابخانە رۆشنبیریەكان داخران. فەرمانی گرتنی شریف پاشـاو ئـەمین عـالی بەدرخان و شێخ سەعید نەورەسی دەرچوو، شریف پاشاو ئـەمین عـالی بدرخـان توانیـان خۆیان رزگار بكەن بـەڵام شـێخ سـەعیدی نەورەسـی دەسـتگیركرا. نەورەسـی سـەبارەت بەگیرانی خۆی بە خورشید پاشای سەرۆكی دادگای ئیتحادیەكان دەڵێت:( من یـەكێك لـە تاوانـەكانم ئەوەیـە كـە خـەم بۆ ناوچـە خۆرهەلآتیـەكان-كوردســتان - ئـەخۆم و داوای دانەوەی مافەكانی ئەكەم و هەمیشە هەوڵ ئەدەم كە بگاتەوە بە كاروانی هونەرو زانسـت و پێشكەوتنی راستەقینە) [19] . دوای قەدەغەكردن چالاكی كوردەكـان خـەلیل خـەیالی لـە ساڵی ١٩١٠ رێكخراوێكی سیاسی بە ناوی -هێڤی- لە كۆمەڵە قوتابیەكی زانكۆی دەوڵـەت پێكهێنا [20] . رووناكبیری قەومی وەك عبدوڵلآ جەودەت و جەمیل قـەدری پاشـاو مـەمدوح سالم... بەحوكمی ئەوەی ئەو گروپە بیری ناسیۆنالیستی رۆژئاواو حەزارەت و مەدەنیەتی ئەوروپا زۆركاری لێكردبوون لە دیدگای غەربیەوە تەماشای واقعی كوردیـان دەكـرد. ئـەو هەموو تەرزە فكرانەشیان لە گۆڤاری رێكخراوەكـەیان(رۆژی كـورد) بڵاوكـردەوە، ئـەوەی شایانی باس بێ ئەو گۆڤارە تاكو ساڵی ١٩١٢ هـەر بـەو نـاوە بڵاودەبـۆوە، بـەڵام دوایـی ناوەكەی بوو بە (هەتاوی كورد)[21]. كۆمەڵـەی هێڤـی نـەیتوانی دەورێكـی سـەرەكی خـۆی

ببینێت، چونکە کۆمەڵەکە تەنیا لەنێو گروپە رۆشنبیرەکاندا بلاوببۆوە، بەرگەی رکابەری چەکداری لەگەڵ ئیتحادیەکان پێ نەدەکرا، لەولاوەش سەرکردەکانی کورد -وەك شێخ سەعیدو ئیبراهیم میللی وعبدولسەلام بارزانیو مەلا سەلیم و میر عبدولرەزاق بەدرخان لەبەشەکانی کوردستان راپەرینی چەکداریان لە دژی ئینقلابیەکان سازدا.شێخ عبدولسلام بارزانی هەر لەساڵی ۱۹۰۷ ەوە لە بروسکەیەکدا بۆبابی عالی لە ئەستەنبوڵ داوای کردووە کە لە ناوچەکەیدا زمانی کوردیو فێرکردنی بە زمانی کوردی بەرەسمی بڕیاری لەسەر بدرێ، بەلام ئەو داواکاریەی شێخ لە دیدگای ئەستەنبوڵ بە کارێکی جودا خوازی لەقەڵەم درا [٣٢]. هەربۆیە لەکۆتایی ۱۹۰۷ تاکو سەرەتای ۱۹۰۸ سوپای عوسمانی هەمو گوندەکانی ناوچەکەی سوتاندو ماڵەکانی تالان کردو خەڵکەکەشی بەرەو زیندانەکان راپێچ کردن. لەساڵی ۱۹۱۳ جارێکی تر شێخ لەناوچەکەدا دەستی بەکاری خۆی کردەوە هەر بۆیە سلێمان نەزیف لێپرسراوی ویلایەتی موسڵ فەرمانی گرتنی شێخ عبدولسلامی دەرکرد، بەلام خۆشبەختانە شێخ ئەمجارەش توانی رزگاری ببێت. لەکۆتایی ۱۹۱٤ شێخ بە خۆی و سێ لەپاسەوانەکانی بەدەستی سۆفی عبدالله ناوێك تەسلیم بە سلێمان نەزیف دەکرێن و فەرمانی لەسێدارەدانیان بۆ دەردەچێت، ئەو فەرمانە لە ۱۹۱٤/۱۲/۱٤ جێبەجێکراو هەواڵێکی دیکە دەڵێ لە کانوونی دووەمی ۱۹۱٥ لە سێدارە دران [٣٣]. لەنێو کوردستانی باکوریش کۆمەڵە سەرکردەیەکی کورد کۆببونەوە بە نهێنی خەریکی خەباتی سیاسی بوون کەسانی وەك شێخ عبدولقادری شەمزینیو مەلا سەلیم و شەهابەدین و حاجی موسا سەرکردایەتی ئەو کۆمەڵە نهێنیەیان دەکرد.ئیتحادیەکان بەنیازی دەستگیرکردنی مەلا سەلیم و سەرکوتکردنی کۆمەڵەکە: لە حوزەیرانی ۱۹۱۰ ئالایەکی لەشکر دەنێرنە سەر رێگەی وان- بەدلیس. مەلا سەلیم لەوێ دەستگیر دەکەن. هەر کەشەهابەدین بەمە دەزانێت هێزێکی پێکهاتوو لەسەد سوار

دەنێرێتە سەر لەشکرەکەی تورك دەتوانێت مەلا سەلیم رزگاریکات [٢٤] . ئەو رووبەڕوو بوونە چەکدارییە خاڵی وەرچەرخانی شۆرشە چەکدارییەکەی مەلا سەلیم بوو، لەنێوان ساڵانی ١٩١٠ -١٩١٣ ئەو کۆمەڵە شۆرشگێرە توانی بەشێکی وڵات لەژێر دەسەڵاتی ئیتحادییەکان رزگاریکات، بەلاّم لەشەڕێکی نێو شاری بەدلیس مەلا سەلیم و دە لە پێشمەرگەکانی هانا دەبەنە بەر قونسولیەی رووسی لەبە دلیس کاتێك لە ساڵی١٩١٤ جاڕی جەنگی یەکەمی جیهانی درا، ئیتحادییەکان لە دژی رووسیاو ئینگلیزو فەرەنسا دەچنە پاڵ ئەڵمانیا هەر بۆیە لەگەڵ هەلاّیسانی جەنگ هێرش دەکەنە سەر قونسولیەکەی رووسیا و مەلا سەلیم و هاوڕێکانی لەنێو شاردا شەهید دەکەن، شۆرشەکەی مەلا سەلیمیش هەر وەك ئەوەی عبدولسلام بەهۆی تابوری پێنجەم سەرکوتکراوە، هەر وەك مەلا سەلیم خۆی ئەو راستیە لە دادگا کارتۆنیەکەی ئیتحادیەکان رادەگەیەنێت: خودا نەسرەتی بە ئێمە بەخشی بەلاّم غایەن هەبوو لەبەر ئەوە خودا نەسرەتی لەئێ ە سەندەوە [٢٥] . دوای ئەو نسکۆ یە میر عبدولرزاق بەدرخان کە ساڵی ١٩٠٩ باڵوێزی ئەستەنبول بوو لەشاری پترسبۆرگی رووسی ٢٦ . داوای لەکاربەدەستانی رووس کرد کە پشتگیری بکەن لە دامەزراندنی ئیدارەیەکی کوردی لە کوردستاندا.

لەنێوان ساڵانی ١٩١٢-١٩١٣ عبدولرزاق دەچێتە شاری ورمێ لەوێ داوا لە سمکۆ دەکات کە پێکەوە بە پشتیوانی رووس لە دژی دەوڵەتی عوسمانی - ئیتحادی- شۆرش بەرپابکەن. لەساڵی ١٩١٣ عبدولرزاق و سمکۆ لەشاری(خوی) کۆمەڵەیەکی رۆشنبیری بە نێوگیخاندی پێك دێنن [٢٧] . ئارمانجی ستراتیژی کۆمەڵەکە هەروەك عبدولرزاق دەڵێت: (بریتی بوو لە بلاّوکردنەوەی وشیاری نەتەوایەتی) کوردایەتی لەناو کورددا.

ساڵی ١٩١٤ عبدولرزاق توانی بە یاریدەی رووسیا بەڕێوەبەرایەتی‌یەکی کوردی لە چاڵدیران دابمەزرێنێ، ئەو پشتگیریەی رووس بە تەواوی حکومەتی ئەستەنبوڵی نیگەران کرد بوو، چونکە ئەوان خۆیان بە یاریدەی فەرەنساو بەریتانیا و جولەکەکان عبدولحمیدیان لەسەر کار لابرد، بۆیە دەترسان ئەو هەوڵەی عبدولرزاق لەو بارودۆخەدا کاریگەری خۆی لە نێو کوردەکانی نێو سوپای عوسمانی بکات.

هەربۆیە لە رۆژنامە رووزەردەکانی ئەستەنبولْ، وەك: وقت، صباح، تصویری أفكار [٢٨] ... بۆ وروژاندنی هەستی ئایینی‌و چەواشەکردنی رای گشتی نێو ئیمپراتۆریەت پروپاگەندەی بێ ئایینی شۆرشەکەی عبدولرزاق هەروەها کافربوونی عبدولرزاقیان بڵاوکردەوە، دەمێك بەلشەفیەکان لە ئۆکتۆبەری ١٩١٧ دەسەلاتیان گرتە دەست، لە کانوونی یەکەمی ١٩١٧ دا ئاگر بەستێکیان لەگەڵ ئیتحادی‌یەکان راگەیاندو لە ئاداری ١٩١٨ پەیمانی بریست- لیتوفسك کۆتایی بە شەڕی نێوان رووسیاو ئیتحادیەکان هێناو عبدولرزاق خۆشی لە کوردستانی باشوور تیرۆر کرا [٢٩].

لەو دەساڵەی فەرمانداری ئیتحادیەکان ١٩٠٨-١٩١٨ تیرۆرو توندو تیژی‌و چەوساندنەوەی نەتەوەیی‌و بەکۆمەڵ کوشتن و کۆچ پێکردن و سەپاندنی سیاسەتی بە تورکی کردن کردارێکی سروشتی ئەو کۆمەڵە شۆفینی‌یە بووە.هەروەك فەیلەسوفی پان (تورکیزم زیاء کوك) دانی پێدادەنێت.(تورانیەکان دەبێ بەزۆری چەك هەموو جیهان بخەنە ژێر دەستی خۆیانەوە) [٣٠] . لەنێوان ساڵانی جەنگی جیهانی یەکەم ١٩١٤-١٩١٨ کوشتارێکی بێوێنەیان لە کوردو ئەرمەن کرد. بە حوکمی ئەوەی لەنێو سوپاکەی ئیتحادیەکان سەربازی کورد هەبوون، بۆیە هاوپەیمانەکان و کەمالیەکان و هەندێ کۆسمۆپۆلیتی کوردیش تاوانی کوشتاری بەکۆمەڵی ئەرمەن لەسەر بزوتنەوەی

ئازادیخوازی کورد حسێب دەکەن! هەر بۆیە بە پێویستی دەزانین هەندێ رۆشنایی بخەینە سەر ئەو بابەتە.

مێژووی کورد و ئەرمەن لەزۆر شتدا لەیەك دەچن. پەیمانەکەی ١٦٣٩ هەر لەمەڕ داگیرکردن و ودابەشکردنی کوردستان نەبوو، بەڵکو بەپێی بەندەکانی هەمان پەیمان بەشی رۆژهەڵاتی ئەرمەنیا بوو بە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی سەفەوی‌و بەشی رۆژئاواشی خزێنرایە نێو قەڵەمڕەوی عوسمانی، ئەو بەشی رۆژهەڵاتی ژێر دەستی فارسەکان، لەئاکامی بەزینی لەشکری ئێرانی لە شەڕێکی دوو ساڵە١٨٢٦- ١٨٢٨ دەگەڵ رووسیای قەیسەری بە گوێرەی پەیمانی ئاشتی تورکمنچای ١٨٢٨ بە ئیمپراتۆریەتی رووسی لکێنرا [٣١]. لە چارەگی سێیەمی سەدەی نۆزدەهەمیش دەوڵەتانی ئەورووپی لە ململانێیەکی بەردەوام بوون لەسەر شوێن توندکردنیان لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دا. بەجۆرێك بە پێی رێککەوتننامەی بەرلین ١٨٧٨ دەوڵەتانی ئەورووپا توانیان جۆرە ژێرۆژەیەکی حوکمی زاتی ئەرمەنی لەسەر کوردستان بسەپێنن [٣٢]. دەمێك جەنگی یەکەمی جیهانیش هەڵگیرسا سەرانی رووسی مژوڵی جۆشدانی ئەرمەنیەکانی دوڵەتی عوسمانی بوون و دەیانویست لەسەر حسێبی کورد (ئەرمەنیای گەورە) دابمەزرێنن. ئەوەی شایانی باس بێت لەنێوان ساڵانی ١٩٠٨-١٩١٤ نزیکەی دە هەزار خەبیرو سەربازی رووسی لەناوچەی ئازەربایجان مۆڵیان دابوو.

رووسەکان هەمیشە مژوڵی ئەوەبوون عەشیرەتە کوردەکانی رۆژئاوای دەریاچەی ورمێ بکەنە سەربازو بەگژ دەوڵەتی عوسمانیان وەبنێن. کوردەکان بەوکارە خەریك بکەن بۆئەوەی بەگوێرەی پلانێکی گەندەڵ ولایەتەکانی رۆژهەڵات و باشوری رۆژهەڵاتی تورکیا بۆخۆیان گل بدەنەوەو کیانێکی ئەرمەنی لە ناوچەکەدا دابمەزرێنن [٣٣]. بەمجۆرە سەرکردەکانی ئەرمەن لە تۆمارەکانی خۆیاندا هەمیشە ئیدیعای ئەوەیان دەکرد کە(هیچ

مەڵبەندێك لە جیهاندا بەقەد مەڵبەندەکانی وان و بەدلیس ئەرمەنی نین) هەروەها سەبارەت بەنێوی( مافی مێژوویی) ئەرمەن بەسەر کوردستانەوە لە تۆماری ئەرمەنیەکان واهاتووە: ئەو نیشتمانە (کوردستان) چەندین سەدەیە نەتەوەیەکی لەسەر دەژی وەکو ئێمەی ئەرمەن لەرەگەزی ئارین و ئێمەش هەست دەکەین کە ئەو نەتەوەیە زیاتر لەئێمەوە نزیکن وەك لە تورك. بەلاّم هەرچەندە کەبەشێکی ئەو نیشتمانەیان– خۆهەر بەدەستی ئەرمەنیەکانی چاخە کۆنەکان ئاوەدان کراوەتەوە، ئەمڕۆ بەزۆری بە ئیسلام کراوە [24] . ئەمەو میجەر نوئیل -لۆرانسی کوردان– لە یاداشتەکەیدا پێشنیاری ئەوەی دەکرد کە ئەگر بێت وبتوانرێ کوردەکان بکرێنە(مەسیحی) ئەوە دەرفەتی پێکەوە ژیانی کوردو ئەرمەنەکان زێتر دەڕەخسێت [25] .دەمێکیش ئەنجومەنی بالأی هاوپەیمانەکان پەیمانی سیڤەریان دەرکرد هەر چوار ویلایەتی تەرابزوون و ئەرزەرۆم و وان و بەدلیس بۆ ئەرمەنەکان دانابوو [26] . لێرەدا نامانەوێ بلێین ئەو کوردانەی لەنێو سوپای عوسمانیدا بوون لەو روانگەوە - وشیاری نەتەوەیی‌و خۆشەویستی کوردستان - وای لێکردوون کوشتاری ئەرمەن بکەن. چونکە هەمان ئەو سەربازە بەنێو کوردانە لەگەڵ سوپا ئیتحادیەکان نزیکەی ملیۆنێك کوردیشیان کوشت [27] . لێرە ئێمە نامانەوێ بە هیچ جۆرێك داکۆکی لەهەڵوێستی ئەو سەربازە کوردانە بکەین، بەلاّم لەهەمان کاتیشدا بەڕاشکاوی دەڵێین کە خەباتی ئەرمەنیەکان لە پێناوی رزگاری نەتەوایەتی‌و ئایینی مۆرکێکی فراوانخوازی هەبووە، چونکە بەئاشکرا بەفیتی هاوپەیمانە مەسیحیەکان و روسیای قەیسەری نیازیان بووە لەسەر حسێبی کورد کیانێکی قەومی لەسەر بەشێکی کوردستان دابمەزرێنن. ئەمەو سەرانی بزوتنەوەی سیاسی کورد نەك هەر داکۆکیان لە ئەرمەن کردووە.بەڵکو نزیکەی گیانی پەنجا هەزار ئەرمەنیان لەدەست ئیتحادیەکان رزگارکردووە. ئەمەو لە کوردستانی باشووریش (شێخ ئەحمەد بارزانی هێزێکی پێکهاتوو

لـە دووسـەد چـەکداری ناردۆتـە کوردسـتانی بندەسـتی تورکیـا بۆئـەوەی گیـانی چـەند خێزانێکی ئەرمەنی رزگاربکات . یەکێك لەو خێزانانەی هێزە کوردییەکە رزگاری کردووە خێزانی ئەندارتیك پاشا بووە.

ئەوەی شایانی باس بێت ئەو هێزەی کورد چـوادە کەسـی بەدەسـتی تورکـەکان کـوژران [٢٨] . لەبـەر ئـەوەی کـورد حکومـەتی سـەربەخۆی نـەبووەو دبلۆماسـیەتی بزووتنەوەی سیاسی کوردیش لەئاستێکی وادا نەبووە رووی راستی ئەو تاوانـە نـەك هـەر بەجیهان بناسێنێ، بەڵکو بەکۆمەڵی کورد خۆیشی! ئەوەتا دوای ئەو هەموو کوشـتارەی ئەرمەن و کورد، تەوفیق پاشا سەرەك وەزیرانـی حکومەتـە شۆڤینییەکەیتورك زۆر بـێ شەرمانە لە کۆنگرەیەکی لەندەن دا هەموو تاوانەکە دەداتە پاڵ کورد: ئـەوەی کوشـتاری ئەرمەنیان کرد کورد بوون، تورك و حکومەتەکەشیان لـەوەبێ بەرین و ئەگـەر پێویسـتی جەنگ و سەرقاڵ بوون نەبوایە بەجەنگەوە ئەوا حکومەت نەیدەهێشت ئـەوە روو بـدات و سزای ئەوانەشی دەدا کە راستەوخۆ کردویانە [٢٩].

# پەراوێزو سەرچاوەکان

١-مصطفى خوران. اسرار الانقلاب العثماني، تونس ١٩٨٤.

٢-ساطع الحصري، البلاد العربية والدولة العثمانية، بيروت ١٩٦٠.

٣-گۆڤاری هیوا، ژ:٧ ،پاریس ١٩٩٠.

٤-مصطفى خوران. اسرار الانقلاب العثماني، تونس ١٩٨٤.

٥-راموز زور، ارنيست، تركيا الفتاة والثورة ١٩٠٨ - بيروت ١٩٦٠.

٦-هەمان سەرچاوە

٧-مصطفى خوران. اسرار الانقلاب العثماني، تونس ١٩٨٤.

٨-گۆڤاری هیوا، ژ:٧، پاریس ١٩٩٠.

٩-رامو زور، ارنيست، تركيا الفتاة والثورة ١٩٠٨ - بيروت ١٩٦٠.

١٠-رۆژنامەی ئاڵای ئازادی ژمارە (١٢).

١١-گۆڤاری راپەرین. ژ:٢، پاکستان ١٩٩١.

١٢-زیاء کوک ئالپی رۆڵە کورد لە رۆژنامەیەکی دیاریەکری دەنوسێ:(دیابەکرو دانیشتوانی وەبگرە هەموو شارەکانی کوردستانی ژووروو تورکن، زیاء زۆری پێ ناخۆش بووە پێی بڵێن کوردە، هەندێك لە دوژمنەکانی توانجی ئەوەیان تێدەگرت کە تورك نیە، کەچی لەهەموو کەسێکیش زیاتر لافی تورکایەتی لێ دەدات، لەوەڵامی ئەوەدا پارچە شیعرێکی داناوە لەژێر ناوی (بۆنەو پیاوەی بە من دەڵێ تورك نی) تێیدا وتویەتی:

من تورك بم یان نا هاوڕێی تورکم

ئێوەش تورك بن یان نا دوژمنی تورکن

١٣- دکتۆر جمال نەبەز،بیری نەتەوەیی کورد نەبیری قەومی ڕۆژهەلأت و نەبیری ناسیۆنالیزمی ڕۆژئاوایی‌یە، ستوکهولم ١٩٨٤.

١٤-ڕۆژنامەی ئالأی ئازادی ژمارە (١٠).

١٥- د. بلەج شێرکۆ، کیشەی کورد، مێژینەو ئیستای کورد، ئورمیە ١٩٩٠.

١٦- ئەورەسی و خەباتەکەی.

١٧- ڕۆژنامەی کوردستان.

١٨- د.عثمان علي القومية والفكر القومي الكردي، ١٩٩٠.

١٩- مەسعود بارزانی، بارزانی‌و بزوتنەوەی ئازادیخوازی کورد، بەرگی یەکەم ١٩٩٢.

٢٠- سەرچاوەی پێشوو.

٢١- گۆڤاری ڕۆژی نوێ، ژە،سلێمانی ١٩٦٠.

٢٢- سەچاوەی پێشوو.

٢٣- گۆڤاری ئالأی ئیسلام: کەنەدا.

٢٤- گۆڤاری ئالأی ئیسلام، ژ:١ سال:٧، کەنەدا ١٩٩٣.

٢٥ گۆڤاری ڕۆژی نوێ، ژ:٤، سلێمانی ١٩٦٠.

٢٦- Kurdistan News No:3 1993

٢٧- گۆڤاری هیوا، ژ:٧، پاریس ١٩٩٠.

٢٨- د.كمال مظهر، كردستا في سنوات الحرب العالمية الاولى، بغداد ١٩٨٤.

- Kurdistan News: No: 3/1993

٢٩- گۆڤاری ئالأی ئیسلام، ژ:١ کەنەدا ١٩٩٣.

٣٠- S, Shaw,.history of ottoman Empire.

٣١- گۆڤاری یەککگرتن ژ:٤، نرویج.

٣٢- د.كمال نوقه، كرنۆلۆژیای مەسەلەی موسلْ، وەرگێرانی سەلام ١٩٩٣.

٣٣- سەلام: ناسیۆنالیستی تورك و سەرهەڵدانی بزوتنەوەی سیاسی کورد ١٩٩٢.

٣٤- ئەو بەکۆمەڵ کوشتن و ماڵوێرانیەی ئیتحادیەکان لەماوەی دە ساڵی حوکمیا بەسەر کوردیان هێناوە، عوسمانی یەکان بەماوەی سێ سەدە بەسەر کوردیان نەهێناوە ئیتحادیەکان بە پێی سیاسەتی پەرتکە زاڵ دەبی بەرنامەیەکی ئەهریمەنییان بۆ خاشەبرکردنی رەگەزی غەیرە تورك دانا، هەرچی کوردە لە وڵاتی خۆیانەوە بە وڵاتی تورك ئاوارەو پەرش و بڵاوبکرێتەوە بە مەرجێ ژمارەی ئەو دورخراوەو راگوێزراوانە لەهەر شارێکی تورکیدا زیاتر نەبێ لە٥٪ی دانیشتوانە تورکەکان، لەئاکامی ئەو کردار شۆفێنیی‌یدا ٥٠٠ هەزار کورد گیانیان لەدەست داو ٧٠٠ هەزاریش بە زۆری بۆ ئەنادۆڵ راگوێزرانەوە. بەشێکی زۆری ئەو خەڵکە کڵۆڵە راگوێزراوانە هەر بە دەم رێگاوە سەرما؛ سەختی زستان و ماندوبوون و برسێتی کوشتنی، بەشێکی تریشیان پێش ئەوە؛ بگەنەشوێنی بۆ راگوێزراو تورك کوشتنی. لەماوەی شەش حەوت مانگی یەکەمی جەنگ لە سەرجەمی دوازدە هەزار کەس ... کوردستانی باکوور نزیکەی ٨ هەزار کەس مردن مامۆستا ئەحمەد خواجە لەبەرگی یەکەمی کتێبە بەنرخەکەیدا (چیم دی) وێنەیەکی سەردەمی جەنگمان لە سلێمانی‌و دەورووبەری بۆ تۆمار دەکات. هەناسەی خۆشی نەما برسیەتی‌و نەخۆشی‌و هەموو جۆرە پەتایەك وڵاتی داگیرکرد، دەرمان، پزیشك، چارەسا نەبوو، لە لادێدا ژن، پیاو، منداڵ لاشەی لەبرسان مردوو شەقام و کەلاوەکانی پڕ کردبوو، جا تەنیا گیان هەرزان و نان گران بوو، سەزەرای ئەو گرفتارییە لە ناوەراستی شارا لە سلێمانی‌و دێهاتەکاندا دەستە دەستە لاوانی کورد ئەکران بە نیشانەو بە دەستڕێژی سەربازی تورك ئە کوژران. چارەنوسی ئەرمەنیەکانیش لە کورد باشتر نەبوو ئەوەتە رۆژنامەنووسەکانی رووس دەنوسن کە شاری وان نە کەسێکی زیندووی تێدا

ماوەو نە خانویەكی بە پێوە ماوە. لەشاری بەدلیسدا لە هەژدە هەزار ئەرمەنی تەنیا ٣٠٠–٤٠٠ ژن و منداڵ لە مردن رزگاریان بووە.لە ٢٥ هەزار ئەرمەنی نێو ئەرزەروم تەنیا دووسەد كەسێك رزگاری بووە.

٣٥– لەشاری موش و ئەو سێ سەد گوندەی دەوروبەری لە شاردا ٢٥ هەزار ئەرمەنی دەژیان پاش رەشە كوژییەكە تاكە كەسێكی لێ رزگار نەبووە!

٣٦– كەواتە ئەو ماڵوێرانیەو رەشە كوژیەی بەسەر كوردو ئەرمەندا هاتووە بە هیچ جۆرێك نابێ لەسەر كورد حسێب بكرێ. لێرەدا ئێمە پرسیارێك دەكەین ئایا هەڵوێستی ئەو چەند هەزار كەسەی بە نێو كورد لەنێو سوپای عێراق دا ١٨٢ هەزار كوردیان گوم كردو چوار هەزار گوندی كوردیان وێران كرد دەبێ لەسەر كوردو بزوتنەوەی رزگاریخوازی كورد حسێب بكرێ.

٣٧– د.بلەج شێركۆ ، كێشەی كورد، مێژینەو ئێستای كورد، نۆرمیە.

## پێشەکی

ئەم باسە،بێجگە لەپێشەکی، لەسێ بەش پێکهاتووە. لەبەشی یەکەم بە کورتی ئەو هۆکارە دەوڵیو ناوخۆییانە خراونەتە روو کە دەوری گرنگیان بینیوە لە دروست کردن وپێگەیاندن و سەرخستنی کەمالیەت، چونکە ئەو نوسینە دەری دەخات کە کەمالیەت، بزوتنەوەیەکی سروشتی نەبووەو بەڵکو دەسەڵاتێك بووە بۆ لەنێو بردنی خەلافەت و حەزارەتی ئیسلامی شەرقی، لەبەشی دووەم، باس لەئامانجی ستراتیژی کەمالیەت کراوە. لەو بەشەدا مەسەلەی روخاندنی خەلافەتی ئیسلامی جەختی لەسەر کراوە. بە دیدی نوسەر: ئەگەر کەمالیەت بە جیدی تەعبیر لە تورکایەتی بکا، ئەوە نە دەبوو خەلافەت لە نێو بەرێ، چونکە مانەوەی خەلافەت نەك هەر شکۆیەك بوو بۆ عەرەب بەڵکو شکۆیەکی مەزن بوو بۆ تورك هەروەها بەمانەوەی خەلافەت، تورك نەتەوەی پلە یەك دەبوون لە رۆژ هەڵاتی ناوەراست و بەشێکی ئەوروپا ! لەبەشی سێیەم کە تایبەتە بە دیدی کەمالیەت لەمەڕ مەسەلەی کورد. لەو بەشەش هەڵوێستی پڕ لە ئیزدیوازیەتی کەمالیەت لە قۆناغەکانی تەمەنیدا خراونەتە روو.

## شەڕی سەربەخۆیی کەمالیەکان و چارەنوسی خەلافەتی ئیسلام و دۆزا کوردان

پێش ئەوەی باس لەئامانجی ستراتیژیەتی کەمالیەت بکەین، وا بەچاك دەزانین، لەو هۆکارانە بدوێین کە دەوری گرنگیان بینیوە لە دروست کردنی کەمالیەت و سەرخستنی کەمالیەتدا:

## ١- هۆی سەرهەڵدانی كەمالیەت

بێ گومان زۆر هۆكار هەن كەڕێ خۆشكەر دەبن بۆ سەرهەڵدانی بزوتنەوەیەكی سیاسی یان كۆمەڵایەتی...هتد. چەندەها هۆكاریش لە پاڵ سەرهەڵدانی بزوتنەوەی كەمالیەت بوون. یەكێك لەو هۆكارانە مەرجەكانی ئاگربەستی مۆدرۆس بوو ئاگربەستی مۆدرۆس، كەلە (٣٠)ی تشرینی یەكەمی ١٩١٨ لە نێوان هاوپەیمانەكان و ئیتحادیەكان مۆركرا چەندەها مەرجی توندی لە خۆگرتبوو، وەك پرۆژەی روخاندنی دەسەڵاتی سیاسیو رۆحی خەلیفەی ئیسلامیو داگیركردنی شوێنە ستراتیژیەكان دەوڵەت وەك دەردەنیل و بسفۆر هەروەها چەك كردنی سوپای دەوڵەت

١.ئەمەو بەپێی بەندی حەوتەمی ئاگربەستەكە، هاوپەیمانەكان بۆیان هەبوو هەموو شوێنە ستراتیژیەكانی تری دەوڵەت داگیر بكەن،هەر بۆیەش دوای ئاگربەس دەستیان بەسەر موسڵ داگرت

٢ . هەر بەگوێرەی ئەو ئاگربەستە، دەبوو سوپای دەوڵەتی عوسمانی لە قەفقاس بكشێتەوەو هێڵی ئاسنین بكەوێتە ژێر كۆنترۆڵی هاوپەیمانەكان. هەرچی ناوچە عەرەبیەكانی نێو قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانی وەك حیجاز، یەمەن، سوریا و عێراق دەبوو ئەوانیش بكەونە ژێر دەسەڵاتی هاوپەیمانەكان وێڕای ئەوەی دەسەڵاتی حكومەتی ئەستەمبوڵ بەو مەرجانە رازی ببوو نەیدەتوانی بزاڤێكی ركابەری هێمنیش لە جەماوەر پێك بێنێ لەدژی دەسەڵاتی داگیركەر. لەو لاوەش هەندێ كۆمەڵەی سیاسی دروست بوون وەك (جمعیة أصدقا الانطلین) و(جمعیة المبادی الولسنیة) سەرانی ئەو كۆمەڵانە لەو باوەڕەدا بوون كە بە هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئینگلیزو ئەمەریكا، دەتوانن دەوڵەتی عوسمانی رزگار بكەن

٢ . بەحوكمی ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی دەوڵەتێكی فرە نەتەوەو فرە دین بوو، هەر بۆیە چەندەها كۆمەڵەی قەومیو دینیو مەزهەبیش دروست بوون هەریەك بانگەشەی لایەنێكی سیاسیو قەومی سەربەخۆی دەكرد.

هەروەها بڕیارەكانی پەیمانی سیڤەر خاڵێكی تری بە هێزكردنی كەمالیەت و بە میللی كردنی بزوتنەوەی كەمالیەت بوو، چونكە بە پێی ئەو پەیمانەش وڵاتانی عەرەب لەتوركیا جیادەكرانەو وە بەشی توركیای ئەورووپیش بۆ یۆنان دانرابوو هەروەها ئەرمەنەكانیش، دەوڵەتێكی قەومی سەربەخۆیان بۆ دانرابوو بۆ كوردانیش ناوچەیەكی حوكمی زاتی [1] . ئەمەو حكومەتی ئەستەمبوڵ بەو پەیمانەش رازی ببوو. لەلایەكی تریش سوپای یۆنانی توانی بووی بەشێكی دەوڵەتی عوسمانی داگیر بكات. ئەو هەموو روداوانە كەهەمووی دەستكردی هاوپەیمانەكان بەگشتیو ئینگلیز بە تایبەتی بوون، دەرفەتێكی لەباری بۆ مستەفا كەمال خوڵقاند كە ئەوەی ئینگلیز بە ئاشكراو راستەوخۆ پێی نەكرا، بزوتنەوەكەی مستەفا كەمال بیكات. لەحاڵەتی واشدا مەسەلەی زەمان و شوێن زۆر گرنگن بۆ بە شەرعی كردنی بزوتنەوەیەك. لە رووی كاتەوە، ئەوە لە پێشەوە ئامادەمان پێكرد، زۆربەی دەوڵەت داگیركرابوو، چەندەها كۆمەڵەی سیاسی لە دژی یەكێتی دەوڵەت خەباتیان دەكرد، خەلیفەش كە رەمزی یەكبوونی دەوڵەت و میللەتە لەبەردەم هاوپەیمانەكان بە چۆكا هات بوو. لێرەدا مەسەلەی دروشمی بریقەدار وەك پاراستنی یەكێتی دەوڵەت و دەركردنی سوپای داگیركەر دەوری گرنگی خۆی هەیە، مستەفا كەمالیش لەبەرایی لەسەر ئەو دروشمانەوە بانگی سوپاو لاوان و عەشایەری دەكرد بۆ مەسەلەی ویلنیش ناوچەی كوردستانی باكوور بۆ شۆڕش خۆی لەخۆیدا چەند ئاكامێكی نەرانیزی هەبوو بۆ هاوپەیمانەكان و كەمالیەكان. ئەو ناوچەیە بەپێی ڕێكەوتننامەی سایكس بیكۆ بە روسیای قەیسەری درابوو، بەڵام سەرانی كودەتای سووری رووسی بە

گوێرەی ئاگر بەستی ١٩١٧ و پەیمانی بریست لیتیۆفیسك ئازاری ١٩١٨ لەشکری روسی یان لەهەرێمەکانی کوردستانی باکور کشاندبۆوە.

ئەمە لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە ئەو ناوچەیە هەرگیز بەتەواوی نەکەوتبووە ژێر چاودێری حکومەتی ئەستەمبوڵ و ئینگلیز هەروەها کۆمەڵە سیاسیە کوردەکانیش دەورێکی ئەوتۆیان لەو ناو چەیە نەبووە، هەر بۆیە کاریگەری قەومیە کوردەکان لەسەر عەشایەرەکانی ئەو ناوچەیە زۆر لاواز بوو. لەو بارەیەوە ئیڤنستۆنی عەقیدی ئینگلیزی دەنوسێ: رای گشتی عەشایەری کورد هیچ گرنگی بەمەسەلەی سەربەخۆیی‌و حوکمی زاتی نەدەدا بەڵکو لەگەڵ ئەوە دابوو کە لە ژێر حوکمی تورکی دا بێ[٥]. ئەو هەڵویستەی سەرکردە عەشایەری‌و سوپاییەکانی کورد چەندەها هۆکاری کۆمەڵایەتی سیاسی لەپاڵ دابوو. ئەو سەرکردانە بە حوکمی پێکهاتنی کۆمەڵایەتی و بەرژەوەندی خێڵەکی‌و ترسی دەسەڵاتی مەسیحی ئەرمەنیەکان هەڕەشەی کۆمۆنیستی لە ناوچەکەدا، هەروەها پاشماوەی شکستی هەردوو زنجیرەی راپەرینی چەکداری ١٨٠٦–١٨٨٠ و ١٩٠٨–١٩١٤ هۆکاری تری گرنگ بوون، کەعەشایەری ئەو ناوچەیە ئەو هەڵوێستەیان هەبێ‌و بیری قەومیش لە ناوچەکە تەشەنە نەکات[٦]. بەم جۆرە ئەم بۆشاییە ئیداری‌و عەسکەریە هەرێمەکەی گرتبۆوەو هەرەشەی لە پرۆژەی ئایندەی دەسەڵات و بەرژەوەندیەکانی هاوپەیمانەکان دەکرد،چونکە هەرێمەکە مەوقعێکی جیۆپۆلەتیکی گرنگ بوو کە دەسەڵاتی هاوپەیمانەکانی نەگەیشتبوێ. هاوپەیمانەکانیش گەیشتبوونە ئەو قەناعەتە کە کوردەکانی خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵ پەیرەوی بەندەکانی ئاگربەستی مۆدرۆس ناکەن[٧]. بەحوکمی ستراتیژیەتی شوێنەکەی، لەرووی جوگرافی‌و سیاسیەوە، نەدەکرا بە هێرشی عەسکەری داگیربکرێ، هەر بۆیە لیژنەیەکیان پێکهێنا بەناوی لیژنەی پاراستنی شارەکانی خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵ بۆ لێکۆڵینەوە لەو مەسەلەیەوە. ئالێرەدا، هەر یەك لە

لەتوركیابۆ ئــەوەی ســەركردایەتی بزوتنــەوە كرێكاریــەكان بكــەن و خزمــەتی پرۆژەكـانی سۆڤیەت بكەن لەناوچەكەدا [21] . ئەو پاڵپشتەی سۆڤیەت بۆ بزوتنەوەكەی مستەفا كەمال سەركەوتنێكی دبلۆماسیو عەسكەری گەورەی بە حكومەتی ئەنقەرە بەخشی. ئەمەو هەر بۆئەوەی بزوتنــەوەی مستەفا كـەمال تـەواو ئینگلیزی نـەبێ، ئیتالیـا رێكەوتننامەیـەكی لەگـەڵ كەمالیـەكان كـرد، بـە پـێی ئـەو رێكەوتنامەیە، كەمالیـەكان توانیـــان ناوچــەی ئەنتاڵیاو دەوروبەری وەربگرنەوە، هەموو سوپای ئیتاڵیا لە ئابی ١٩٢١ ئەو ناوچانەی بـە بەرامبــەر چــەند ئیمتیــازاتێكی ئــابوری چــوڵ كــرد [22] . هـــەروەها فەرەنســـیەكانیش رێكەوتنێكیان لەگەڵ حكومەتی ئەنقەرە كـرد، بـە گوێـرەی ئـەو رێكەوتنامەیـە فەرەنسا دانی بە شەرعیەتی حكومەتی ئەنقەرە ناو هەموو هێزی خۆی لە(٢٠)ی تشــرینی یەكــەمی ١٩٢١ لە ئەقلیقیا كشاندەوەو هەموو كەلوپەلی عەسكەری سوپاكەی بە ٢٠٠ ملیۆن فرەنك بە كەمالیەكاندا [23] . بەم جۆرە مستەفا كەمال بەو هەموو پاڵپشتە میللیو دەولیە توانـی شاری ئەزمیر بـەبێ تەقـە وەربگرێتـەوە و ببـێ بەسـەركردەیەكی رزگاركـەری توركیـا لـە داگیركەران [24] . پاش ئـەوەی لـە ئـەیلولی ١٩٢٢ تـەواوی سوپای یۆنـان لـەخاكی توركیـا كشایەوە، یۆنانیەكان لە كۆنگرەی مۆدانیا لە ١٩٢٢/١٠/١١ دەستبەرداری هـەموو خـاكی توركیا بوون، بەلاَم هەرچی(گەروەكان) بوون تاكو بەستنی كۆنگـرەی ئاشـتی لـە لـۆزان، هەر لەژێر چاودێری هاوپەیمانەكان مانەوە [25] هەروەها ئەستەمبوڵیش هەر لەژێر كۆنـترۆڵی هاوپەیمانەكان بوو ، بەلاَم دەمێك وەفدی حكومەتی ئەنقەرە لە لۆزان بـە پێشـنیارەكانی ئینگلیز رازی بوو، سوپای هاوپەیمانەكان بەبێ تەقە، شاری ئەستەمبوڵیان چۆڵ كرد. [26] پێشنیارەكانی ئینگلیزیش بریتــی بــوون لــە بەرنامــەی ئایندەی حكومــەتی ئەنقــەرە، كــە لــەپێش هەموویانــەوە هەڵوەشــاندنەوەی سیســتەمی خەلافــەو ئیعلانكردنــی حكومــەتێك عەلمانی– لادینی– لە توركیادا.

ئینگلیزو حکومەتی ئەستەنبول، هەریەکەی بەئامانجیك مستەفا کـەمالی هـەلبژارد کـە بـۆ ئەو ناوچەیە بچێ. خەلیفـە وەحیدەددیـن. محەمـەدی شەشـەم، کەوتـە خۆ کـە مسـتەفا کەمالی ئەفسـەری پشـکینەری سـوپایی وەك پشـکینەریکی سـەربازی رەوانـەی لەشـکری سـێی سـوپای عوسمـانی لـە هەریمەکـەدا بکات و لەگـەل ژەنـەرال کـازم قەرەبـەکری فەرماندەی لەشکری سێ نەهیلن هیچ راپەرینیکی میللی، سەربازی یاخود عەشـایەری لـە هەریمەکەدا روویـدات [٨] ٠ لـە لایـەکی تریـش رەفعـەت پاشـا لـە لیدوانیکـی بـۆ رۆژنامـەی (الجمهورية) دەلێت: مستەفا کەمال بەقسەی ئینگلیز بۆ ئەنادۆل چوو، من خویشم لەگەل (١٨) سوار بۆلای چووم و دەستم کرد بە ئیدارەی سوپا لـە سامسۆن. ئەمـەو وەفدیکـی ئینگلیزی کە پیکهاتبوو لە سێ کـەس بـۆ خـوا حـافیزی مسـتەفا کـەمال لـە ئەستەمبول ئامادە بوو. سەرچاوەی تر دەلین: (هارینکتن) ی سەرکردەی گشتی سـوپای داگیرکـەری ئینگلیز مستەفا کەمالی بۆ سامسۆن ناردووە [٩] ٠ پیش ئەوەی مستەفا کەمالی بەو فەرمانە سەربازییە هەلبستێ، وەنیزەلوسی سەرۆك وەزیرانـی یۆنـانی داوای لـە چـوار سـەرکردە مەزنەکەی جیهان کرد کە مافی داگیرکردنی ئـەزمیری خـوارووی تورکیـای لەسـەر مـەبدئی نەتەوەیی پیرەوا ببینن، چوار سەرکردەش بزیاریـان لەسـەر ئـەو داگیرکردنـە دا [١٠] . لـەو بارەیەوە شیخ مستەفا صەبری شیخی ئیسلام ماهیەتی ئەو داگیرکردنـە دەردەخـات کـە بەفیتی ئینگلیز بووە، هـەروەك دەنوسیت: لیژنـەی بـالای هاوپەیمانـەکان کەلـە پـاریس دادەنیشـت و پیکـهاتبوو لەسـەرۆك وەزیرانـی ئینگلـیزو فەرەنسـاو ئیتالیـاو و یۆنـان لــە ئیوارەی ١٤ی مایۆی ١٩١٩ پییان راگەیاندین کە دەبێ سوپای یۆنانی ئـەزمیرو مـەکدۆنیا داگیر بکات. ئاگاداریان کردینەوە کە هەر بەرگریەك لەو داگیرکردنە پیشیل کردنـی ئـاگر بەستی مۆدرۆس دەگەیەنێ. رۆژی دواتـر واتـە(١٥) ی مایسـی سـوپای یۆنـانی ئـەزمیری داگیرکرد [١١] . ئا لەو رۆژەش مستەفا کەمال بەرەو سامسۆن بەرێ کەوت. ئەو داگیرکردنـە

عەسكەرىيە دوو ئاكامى ستراتيژى پيكايەك: بىێ دەسەلات و بێ شەرعى كردنى حكومەتى ئەستەمبول كە بەناو خەليفە وەحيدەددين بەريوەى دەبرد. ئينگليز زۆر جەختى لەسەر ئەو خالە دەكرد بۆ ئەوەى دەولەتى خەليفە لە نەزەرى موسلمانان بەگشتىو تورك بە تايبەتى بێ هيز بكا، دووەم: بە دەسەلاتى كردنى بزوتنەوەكەى مستەفا كەمال. لەو بارەيەوە سير هاركنتۆن سەركردەى سوپاى ئينگليز لە ئەستەمبول دەليت: باشترين شت بۆ ئيمە ئينگليز ئەوەيە ئەستەمبول بەجێ بهيلين و لەگەل مستەفا كەمال پەيوەندى دۆستايەتى ببستن [١٢]. لەنەزەرى مستەفا كەماليش ئەو داگيركردنە عەسكەرىيە تاكتيكىيە، دينەمۆى بزوتنەوەكەى دەبيت لە دژى هەم دەسەلاتى خەليفەو هەم دەسەلاتى داگيركەرى يۆنانى لەئەزمير. هەر بۆيە هەر كە دەگاتە سامسۆن لە ١٦ ى مايسەوە تاكو ٢٤ حوزەيران بنەمايەكى فكرىو سەربازى لەسەركردە سوپايىو خيلەكان و رەش و رووتى ناوچەكە بۆ بزوتنەوەكەى پيك دەهينيت [١٣]. لەپاشان لەئاماسيە كۆبونەوەيەكى نهينى لەگەل هەندێ سەركردەى سوپايى دەكات و هيرش دەكاتە سەر حكومەتى ئەستەمبول و تاوانبارى دەكات بە خيانەت. هەرچى خەليفەش بوو لەبريتى سوپا ئامادە بكا لەدژى داگيركەرى يۆنانى پشتگيرى حكومەتى داماد فەريد پاشا دەكاو داوا لەميللەت دەكات پالپشت حكومەت بكەن، هەروەها خەليفە داوا لە كۆمەلەى بەرگرى مافەكانى ئەرابزۆن دەكا لەگەل حكومەتى فەريد پاشا ريك بكەوێ. ئەو هەلويستەى حكومەتى ئەستەمبول، راستەوخۆ لە ژير چاوديرى كاريگەرى هاوپەيمانەكان دابوو، زيتر شەرعيەتى بە بزووتنەوەكەى مستەفا كەمال دا بۆ ئەوەى بزووتنەوەكەى كەمال لە چوارچيوەى ميليشيا دەربچێ شيوەيەكى نيزامىو حكومى وەربگرێ، ئينگليز عەقيد راولنسونى براى لۆرد كيرزۆنى بۆ ئەرزەروم دنيرێ لەوێ كۆبونەوەيەكى نهينى دەكەن، لەپاشان لەشەوى ٨/٧ تەموزى ١٩١٩ مستەفا كەمال بەرنامەى حكومەتى ئايندەى بە

مەزهەر مفید قنصەوی نهێنی پارێزی خۆی دەنوسێ: کەبریتی‌یە لە جاڕدانی نیزامی کۆماری بۆ تورکیاو نەهێشتنی سوڵتان و بنەماڵەی دەسەڵاتدار (خەلیفە) و سەرپۆش لادانی ئافرەتان و تەرپۆشی پیاوان و سەپاندنی شەپقەی غەربی [17] . کۆنگرەی ئەرزەرۆم و سیواس دوو هەنگاوی عەمەلی بوون لە راگەیاندن و چەسپاندنی بەرنامەی کەمالیەت بەتایبەتی (میساقی میللی) کە خۆی لە خۆیدا بەرنامەی حکومەت بوو نەك بزوتنەوەیەکی میلیشیایی. هەر بۆئەوەی ئەوەندە هەیبەتی حکومەتی ئەستەنبوڵ هەیبوو، ئەوەندەش نەمێنێ‌و بزوتنەوەی کەمالیەت بەهێزتر بێ‌و ببێ بە بە دیلی حکومەتی‌ئەستەمبوڵ، ئینگلیز لە ١٦ ی ئازاری ١٩٢٠ شاری ئەستەمبوڵ داگیر دەکاو ئەندام پەرلەمان و زۆر کەسی تری مەدەنی‌و عەسکەری دەگرێ‌و نەفی دورگەی ماڵتایان دەکات [18] . پاش ئەو داگیرکردنە هاوپەیمانەکان داوا لە خەڵك دەکەن کە گوێ رایەڵی خەلیفەبن ! لەولاوەش شێخی ئیسلام فەتوای بەکافر بوونی مستەفا کەمال و گروپەکەی دەدا، هەرچی هێزەکەی مستەفا کەمالیشە هێرش دەکەنە سەر ئەسکی شەهرو چەند ئەفسەرێکی هاوپەیمانەکان دەگرن. وەك بارمتەیەك بۆ ئەندام پەرلەمانە دەست بەسەرەکان لە ماڵتا [19] . ئەو سیناریۆیە وەرچەرخانێکی گرنگی بە شەعبیەت وشەرعیەتی بزوتنەوەی مستەفا کەمال بەخشی، چونکە لەرواڵەتدا تەنها حکومەتی ئەستەمبوڵ تۆکەرو گوێڕایەڵی هاوپەیمانەکان بوو، هەرچی مستەفا کەمال بوو، نوێنەری میللەت بوو، دژ بەسوپای داگیرکەری هاوپەیمانەکان بوو! ئەمەو مستەفا کەمال لە ئەنقەرە پەرلەمان و حکومەتی دامەزراند، دەوڵەتی لینین یەکەم دەوڵەت بوو بەڕەسمی دانی بە حکومەتەکەی ئەنقەرە ناو پاڵپشتێکی ماددی‌و مەعنەوی زۆری مستەفا کەمالی کرد [20] . هەروەها سۆڤیەت لەرێگای مستەفا کەماڵەوە لە نێوان ساڵانی ١٩٢٠-١٩٢٤ (بەتەواوی لە ماوەی حوکمی لینین) خەریکی دامەزراندنی چەند ئەحزابێکی شیوعی بوون

## ٢-کەمالیەت و چارەنووسی خەلافەت

پاش ئەوەی ئیتحادیەکان، خەلیفە عبد ولحەمیدی دووەمیان لەپۆستی خەلافەت لابرد، چەمکی خەلافەت وەك دەسەلاتێکی بالای سیاسیو رۆحی، بوونی لە خۆی لەدەستدا. ئەو بەناو خەلیفانەی لەدوای عبد الحمید دانران [٢٧] خەلیفەی ئیتحادیەکان بوون نەك خەلیفەی ئیسلام. وەنەبێ رۆژئاوا دەرکی بەو راستیە نەکردبێ، بەلام لەنەزەری ئەوان تاکو پۆستی خەلیفە مابێ بەواهەر رەمزێك دەبێ بۆ یەکبوونی گەلانی موسلمان، هەروەها مانەوەی خەلافەت ئەو مانایانەی دەبەخشی[٢٨]:

١-مانەوەی خەلافەت، واتای بوونی نیزامێکی سیاسی شامل بۆ هەموو موسلمانان.

٢-مانەوەی خەلافەت، واتای دینامیکیەتی بەردەوامی مێژووی موسلمانانی دەگەیاند لەژێر سێبەری دروشمێکی سیاسی یەکگرتوودا.

٣-مانەوەی خەلافەت، واتایەکی بوونی (یەکێتی دەولی) بۆپاراستنی ولات و مافی موسلمانان بە واتایەکی تر بوونی خەلافەت مانای رەدکرنەوەی بوونی دەسەلاتی ئیستعمارو بێگانەیە.

٤-خەلافەت رەفزی دابەشکردن و داگیرکردنی ولاتی موسلمانان دەگەیەنێ سنووری دەستکرد قەبولٚ ناکات.

٥-خەلافەت واتای پاراستنی یەکێتی کۆمەلایەتیو یەکێتی ئابوریو یەکێتی دەولی دەگەیەنێ.

٦- خەلافەت واتای پاشماوەی شکۆی ئیسلام و چاخی نبوەتی یەکەم دەگەیەنێ [٢٩]

.

هەر لەو روانگەیەوە، عبدو لحەمید لەیاداشتەکەیدا دەنوسێ: دەولەتە زلهێزەکان کە حوکمی چەند گەلێکی موسلمان دەکەن لە ئاسیا وەك ئینگلیزو روسیا، لە چەکی

خەلافـەت دەترسـان کـە مـن خـۆم پـێ تـەیار کردبـوو هـەر لەبـەر ئـەو هۆیـە (مانـەوەی خەلافەت) توانیان یەکبگرن بۆ لـەناوبردنی دەوڵـەتی عوسمـانی [٣٠] .ئەمـەو پـاش ئـەوەی شـیوعیەکان، دەسـەڵاتی روسـیایان وەرگـرت، چـەندەها بەڵگەنامـەی نهێنییان ئاشـکرا کرد. هەندێك لەو بەڵگەنامە پەیوەستن بە هەوڵی دەوڵەتـە زلهێزەکـان بـۆ لـەنێولا بردنـی خەلافی ئیسلامی: (حکومەتی خاوەن شکۆی روسیای قەیسەری لـەناخی دڵـەوە دەیـەوێ نیزامی خەلافـە لەدەسـت تورکـەکان نـەهێڵێ )هـەروەها لەبەڵگەنامەیـەکی تـر هـاتووە : (حکومـەتی ئیتاڵیـا پاڵپشـتی رای حکومـەتی روسـیا دەکـات لـە زەروری بوونـی دابڕینـی حکومەتی ئیسلامیو... خەلافەت لەتورك بسـتێنرێو هـەروەها ئەگـەر پێویسـت بـوو هـەر بەیەکجاری خەلافەت هەڵبوەشێنرێتەوەو نەهێڵدرێ) [٣١] .

هـەرچی ئینگلیزو فەرەنسیەکانیش بـوون، ئـەوانیش بـەحوکمی ئـەوەی سـەرکردایەتی جەنگی یەکەمی ئیمپریالیزمیان دەکرد، روحی صەلیبیـەت و شکسـتی سـەردەمی شـەڕی صەلیبیەت وا ئاراسـتەی دەکـردن کـە بـەهیچ جۆرێـك نـەهێڵن نیزامی خەلافـەت بمێنـێ. ئەوەتا پاش ئـەوەی مستەفا کـەمالیان زاڵ کرد بەسـەر یۆنـان و کـورددا، سـەربەخۆیی تورکیایان لەبەرامبەر ئەو چەند مەرجە دانا، کە هەموویان واتـای لـە نێوبردنـی خەلافـەت دەگەیەنن [٣٢] :

١-تورکیا پەیوەندی بە ئیسلامەوە نەمێنێ.

٢-خەلافەتی ئیسلامی هەڵبوەشێنێتەوە.

٣-تورکیا بەڵێن بدا بە دامرکاندنەوەی هەر بزوتنەوەیـەك کـە لایـەنگرانی خەلیفـە پـێی هەڵبەستن.

٤-تورکیـا بۆخـۆی دەسـتورێکی مـەدەنی هـەڵبژێرێ لـەجیاتی دەسـتوری عوسمـانی کەلەسەر بنەماکانی شەریعەتی ئیسلام دامەزراوە.

ئەمەو پاش ئەوەی حكومەتەكەی كەمالی‌یەكان بەو مەرجانە رازی بوو، بڕیاری لەسەر ئەو شەش بنەمایەدا كە ببن بەدەستوری دەوڵەتی توركیای نوێ.

١-سیتەمی كۆماری‌و هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی خەلافەت.

٢-میللی یەت- میللەت سەرچاوەی دەسەڵات بێ.

٣-قەومی‌یەت و یەكێتی تۆرانی.

٤-دەولی‌یەت.

٥-ئینقیلابیەت.

٦-عەلمانیەت.

بێگومان پرۆژەی روخاندنی خەلافەت هەر لەبەرایی ئامانجێكی ستراتیژی بزووتنەوەكەی مستەفا كەمال بووە. بەلاّم بە حوكمی ئەوەی ناوچەی كوردی هاوسنوری‌یەكی مەبدئی لەگەلّ ئیسلام و نیزامی خەلافەدا هەبوو، هەروەك لە كتێبەكەی(قاسملو)ش هاتووە: یەكێك لەبەرچاوترین دروشمەكانی‌راپەڕینی ١٩٢٥ دامەزراندنی كوردستانێكی سەربەخۆ لە ژێر چاودێری توركیاو هێنانە سەركاری حكومەتی سوڵتان بوو[٢٤].

دەرك كردن بەو هەقیقەتە، مستەفا كەمال بەئاشكرا بانگەشەی هەڵوەشاندنەوەی خەلافەتی نەدەكرد، بەڵكو پاش ئەوەی لەشەڕی سقاریا سەركەوتنێكی مەزنی وەدەست هێنا، داوای كرد لەقەبی غازی-موجاهید-ی پێ ببەخشن. ئەو میكافیلیەتەی كەمالی‌یەكان قازانجێكی سیاسی‌و عەسكەری‌و میللی زۆری بۆیان هەبوو. بەجۆرێك كەسێكی وەك ئۆزدەمیر بەكردەوە موونافیقەكانی خۆی وای لە كوردان كردبوو كە بەشێخی ئیسلامی بزانن[٢٥].

هەر لەبارەی ئەو ئیزدواژیەتەی کەمالیەتەوە ئارنست هەمنگوای لەوتارێکی بەناوی(چەند نامەیەك لە ئەستەمبوڵی داگیر کراوەوە لەسەردەمی جەنگی یەکەمی جیهان) بۆ رۆژنامەی The Toronto daily Starرۆژی ١٩٢٢/٢/٢٤ دەنوسێ: هەتا پێش چەند مانگێك، جیهانی ئیسلامی مستەفا کەمالی بە صەلاح دینی ئەیوبی دووەم دەبینی. ئاواتیان ئەوەبوو کە بە ئیسلام شەڕ بکا لەدژی مەسیحی‌یەکان وە ببێ بە رابەرێك لەبەردەم هەموو دەوڵەتانی شەرقی لەجەنگێکی پیرۆزدا لە دژی مەسیحی‌یەکان، بەلاَم جیهانی شەرقی ئێستا پەیتا پەیتا باوەڕی بە مستەفا کەمال نامێنێ، هەندێك موسڵمان کە خۆم قسەم لەگەڵ کردوون دەیانوت: مستەفا کەمال خیانەتی لەگەڵ کردووین. ئێستا کەس باسی جیهاد ناکات [٣٦] .

بەڵێ لەو مێژووەی هەمنگوای وتارەکەی نووسیوە، هەڕەشەی ئەرمەنی‌و یۆنانی‌و کورد لە نێو بردرابوو. بەرنامە صەلیبیەکەی مستەفا کەمال کە خۆی لە (بەڵگەنامەی نیشتمانی) حەشاردابوو ئاشکراکردو لە شەوی ٢٩-١٩٢٣/١٠/٣٠ ئیعلانی حکومەتی لادینی‌یەکەی خۆی کرد. پاش ئەو ئیعلانکردنە بەچەند رۆژێك سوپای داگیرکەری هاوپەیمانەکان لە ئەستەمبوڵ کشایەوە. ئەمەو بۆ ئەوی بە یەکجاری مۆرکی ئیسلامی بە دەوڵەتی تورکیای نۆی، نەهێڵێ، مستەفا کەمال ئەنقەری کردە پایتەختی تورکیا. بەپەراوێزکردنی ناوی ئەستەنبوڵ یش خۆی لە خۆیدا ئامانجێکی تری کەمالیەت بوو بۆ روخاندنی یەکێتی ئیسلامی بوو، چونکە لەپاش ئەو روخاندنە نە لەناو تورك و فارس نە لەناو عەرەبانیش زیندو نەکرایەوە، ئەمەش شتێکی ئاسایی‌یە، چونکە هەموو خەباتی عەرەب و تورك فارس، (قەومیەت) ئاراستەی کردوون ورووژاندنی بیری قەومیش لە بڕی وروژاندنی هەستی دینی، ئامانجێکی ستراتیژی هاوپەیمانە صەلیبیەکان بوو، بەواتایەکی تر هەموو خەباتی صەلیبیەکان هەروەك لۆرانس لەبەڵگەنامە نهێنی‌یەکانیدا دەڵێ:

(ئاكامی کۆتایی شەڕی ئێمە لەناو بردنی دەسەلاّتی دینی سولّتانی تورکییە)
چونکە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی یەکەیەکی دینی یەککگرتووە، سولّتانێك حوکمی دەکا خەلیفەی موسلّمانان و سەرکردەی هەموو موسلّمانانی جیهانە [٢٧] . هەرچی خەباتی تورك و عەرەب و فارس بوون، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ خۆ رزگارکردن بوو لەدین، چونکە ئەوان بە دیدی رۆژئاواییەکان لە دەسەلاّتی دین نەگەیشتبوون، هەر بۆیە کە خەلافەت نەما قەومیەت نەك هەر نەیتوانی یەکێتی عەرەب و یەکێتی تورك و یەکێتی فارس و یەکێتی کورد بپارێزێ بەلّکو ئەو شکۆیەی گەلانی موسلّمانان لە هەمبەر رۆژئاوایی صەلیبی هەیان بوو، بە ‌ نەمانی خەلافەت لە نێو چوو.

## ٢- کەمالیەت و چارەنووسی دۆزی کوردان

لەسەردەمی شەڕی سەربەخۆی تورکیا کوردستانی باکوور ببوو بە بنکەی بزوتنەوەی کەمالیەکان. بە حوکمی ئەوەی ئەو ناوچەیە عەشایەری کورد بەڕێوەی دەبرد، سەرەك عەشایرەکانیش هێندەی بیر لە بەرژەوەندی کەسیو خێلّەکانیان دەکەنەوە بیر لەمەسەلەی کورد ناکەنەوە، ئەو رۆحی ناوچە گەریە لە نێو عەشایەری کوردا کەلێنێکی گەورەی لە پەیوەندی نێوان رووناکبیرانی قەومی کورد– کە بە زۆر لە ئەستەمبولْ بوون– خێلّەکان دروست کردبوو. ئەو پەیوەندیە ساردەی نێوان سەرکردە عەشایرەکان و سەرکردە قەومیەکانی کورد فاکتەرێکی بەهێزی سەرکەوتنی بزوتنەوەی کەمالیەکان و شکستی قەومیەکان و عەشایەری کوردبوو. مستەفا کەمال وەك سەرکردەیەکی میکافیلی توانی سوودێکی زۆر لەو کۆمەلّە سیاسیانەی رۆژهەلاّتی ئەنادۆلْ وەربگرێ کە ناسرابوون بە کۆمەلّەکانی بەرگری لە مافەکانی ولایەتەکانی ئەنادۆلْ. هەر بۆ ئەوەی شەقاری نێوان سەرکردە خێلّەکیەکان و رووناکبیرانی کورد فراوانتر بکاو هێزی

عەشایەری کورد بۆ لای خۆی رابکێشێ، بەناوی یەکێتی دین و یەکێتی ولأت زێـ
سەرکردە سوپاییو خێڵەکیەکان چەواشەبکا، لەوتارێکدا تەواوی دیماگۆژیەتی خـۆ
بەکاردێنێ بۆ ئەوەی تەواو دەست بەسەر سایکۆلۆژی سادەی کۆمەڵی کوردەواری ا
بگرێ دەڵێت: ئێمەی کورد و تورك براین لەسەر ئەوخاکە پێکەوە خوێنمان رژاوە ...ئەمڕ
هەردولا یەك دوژمنمان هەیە یەك زۆردار ئەمان چەوسێنێتەوە، بۆیە پێویستە هەمووما
هەست بکەین پێویستیەکی لەوە گەورەترمان لەسەر شانە کە هەر نەتەوەمان بۆ خۆ
بەجیا تێبکۆشێو، پێویستی سەر شانی ئێمە تەنیا رزگاری تورکیاو سەرشانی ئێوەش
تەنیا رزگاری کوردستان نیە ، بەڵکو پێویستی سەرشانی هەموو لایەکمان رزگاری ئـە
ولأتەیە کە تورك و کوردو ئەرمەن نەستوریو گەلێ کەمایەتی تری تیایەو، هەر کاتێ
توانیمان ئەم ولأتە لە بێگانە پاك بکەینەوە، ئەوە قسەیەك نیە دووجاری بکەینەوە
کوردستان ماف و چارەنووسی خۆی وەرئەگرێوتورکیای دەستە خوشکیش دەگا بـ
ئامانج و کەمایەتی تریش ژیانێکی ئاسودەو بێ زۆرداری دەبەنە سەر [٢٨] . پاش ئـە
هەڵوێستە ئیجابیەی مستەفا کەمال وێڕای سەرکردە خێڵەکیەکان هەڵوێستی سەرکرد
سوپاییەکانی کوردیش. بەرامبەر بە بزوتنەوەی مستەفا کەمال هەڵوێستێکی لایەنگر
بوو، ئیحسان نوری پاشاش کە یەکێك لە نوێنەرانی حامیەی ئەستەمبوڵ بوو، لەگەا
کۆمەڵە ئەفسەرێکی دی بۆ پشتیوانی کردنی مستەفا کەمال هانی سوپایان دا تـ
لەحکومەتی (فەرید پاشا) یاخیبن [٢٩] . لە باشوری کوردستانیش ئەحمە تەقی پەیوەندی
بەکەمالیەکان کرد. ئەمەو رەقیب سورچیو ئەحمەد تەقی لە رەواندز مەجلیسی میللییاز
پێك هێنا و رەواندوزیان کردە ناوچەیەکی گرنگ بۆ دەسەلأتی کەمالیەکان، هەردوو خێڵ
هەماوەندیو جەباریش پاڵپشتی خۆیان بۆ کەمالیەکان دەربڕی [٤٠] . کەسێکی وەك ئـۆزد
میر توانی شێخ مەحمود بۆ کەمالیەکان رابکێشێ. ئەو هەڵوێستە لایەنگیریەی شێ

مەحمود بۆ کەمالیەکان وای لە ئینگلیز کرد کە بە دیلێك بۆ شێخ مەحمود بدۆزرێتەوە. ئەو بەدیلەش سەید تەها شەمزینی بوو [41]. لەباکوری ولاتیش، بۆئەوەی بزوتنەوەکەی مستەفا کەمال شێوازێکی نوێ وریکخراوی وەربگرێ لە قالبی میلیشیاو عەشایەری دەربچێو، خاوەن مەنهەجی سیاییو فیکریو سەربازی بێت، مستەفا کەمال داوای بەستنی کۆنگرەیەکی کرد، ئەمە بوو کۆمیتەی سەرۆکایەتی کۆنگرەی ئەرزەرۆم لە ٢٣ی تەموزی ١٩١٩ یەکەم کۆنگرەی خۆی بەست و(٣٥) نوێنەری لە ولایەتەکانی ئەرزەرۆم و بەدلیسیو وان و سیواس تەرابزۆن بەشداری ئەو کۆنگرەیە بوون [42]. ئەوەی شایەنی باس بێ کۆنگرەی سەرکردایەتی کۆنگرەی ئەرزەروم لەهەشت کەس پێکهاتبوو کە سێیان کورد بوون: شێخ فەوزی سەرۆکی نەقشبەندیەکان لە ناوچەی ئەرزانجدا، سەعدوللا بەگی سعدت کە تا ساڵی ١٩١٨ ئەندامی پەرلەمانی عوسمانی بوو، حاجی موسا بەگی میرزادە سەرۆکی هۆزی موتکی [43]. ئەو کۆنگرەیە ١٤ رۆژی خایاند ئەو بریارانەی خوارەوەی لێ دەرچوو [44].

١-نیشتمان، لەنێو سنووری ناسیۆنالدا یەکێتیەکی یەکگرتووە.

٢-لەحاڵەتی روخانی دەوڵەتی عوسمانیدا (گەل) بەرگریو داکۆکی لە بوونی خۆی دەکات دژی هەر شێوەیەك لە شێوەکانی داگیرکردن .

٣-ئەگەر حکومەت نەیتوانی بەرگری لە نیشتمان و سەربەخۆی یەکەی بکات یاخود گرنگی بەو مەسەلەیە بدات، ئەوا پێویستە حکومەتێکی کاتیی کەلە کۆنگرەی نیشتمانی گشتیدا بریاری لەسەر دەدرێ، دروست بکرێ. ئەگەر ئەو حکومەتە پێك نەهات، ئەوا دەبێ دەستەی نوێنەرایەتی بەو ئەرکە هەستێت.

٤-دەبێ هێزێکی نیشتمانی پێکبهێنریت هەروەها دەبێ ئیرادەی گەل لە سەرووی هەموو شتێکەوە بێ.

٦-دەبێ گەرنتی دروستكردن و كۆبونەوەی ئەنجومەنی گەل دابین بكرێ. پێویستە حكومەت بخرێتە ژێر چاودێری ئەنجومەنی گەل.

٧-ویلایەتەكانی رۆژهەلاتی ئاسیای بچوك و ویلایەتی تەرابزۆن و پارێزگاری جانیك یەكێتییەكی تەواو پێك دێنن هەرگیز لەیەك جیاناكرێنەوە، هەموویان بە بە شێك لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دادەنرێت، نابێ تەرابزون و جانیك وەك ولایەتەكانی ئەرزەرۆم و سیواس و دیار بەكرو خەربوت و وان بەدلیس .... نابێ بەهیچ شێوەیەك لەیەك جیا بكرێنەوە هەموو یەكەیەكی ئیسلامی پێك دێنن [٤٥].

لە روانگەی بیری ناسیۆنالیستی مستەفا كەمالدا، كۆنگرە زەمینەیەكی توندو لەباری لەبەردەم پیادەكردنی دیموكرالیزم یاخود دیموكراتیەتی تاكی تورك رەخساند بوو، بە جۆرێك دەسەلاتی رەها بەتاكی تورك سپێردرابوو هەروەها خاكی نەتەوەو كەمایەتی غەیرە توركی بەهی تورك حسێب كرابوو، بەلام سەبارەت بەتاك وكۆمەل و خاكی كورد كۆنگرەی ئەرزەرۆم سەرەتای داگیركردنی فیكری خاكەكەی بوو، هەروەك لەبەندی یەكەم و حەوتەم بریاری كۆنگرە هاتبوو.لەو بارەیەوە د. جمال نەبەز دەنوسێ: ئەو كۆنگرەیە پەیمانی میللی ناسیۆنالی لێدەرچوو، بەپێی ئەوە هەموو كوردستانی عوسمانی خرایە نێو سنوری ناسیۆنالەوە بێ ئەوەی هیچ جۆرە مافێك بۆ كورد دەستنیشان بكرێت [٤٦]. ئەمەو بەگوێرەی بەندی حەوتەم -لەم نوسینەدا- كۆنگرەی ئەرزەرۆم لەرووی پراكتیكەوە رەفزی باوەڕی دیاری كردنی چارەنوسی كەمایەتیەكان لە توركیا دەكا. حسێبكردنی كوردستان خاكی ئەرمەن بەبەشێك لە توركیا خۆی لە خۆیدا دەگەرێتەوە بۆ باوەری بنەڕەتی (كۆمەلەی ئەنادۆلی شەرقی) كە یەكێك لەو باوەڕە سەرەكیەكانی ئەو كۆمەلەیە بریتی بوو لە پاراستنی یەكێتی خاكی توركیا، ئەمەش خۆی

لە خۆیدا ئــەم راستیەی دەگــەیاند کــە کەمالیــەکان قــەبووڵ ناکــەن دەوڵــەتێکی یۆنـانی یـاخود ئەرمـەنی یـا کـوردی لـەنێو خـاکی عوسمـانیدا دابمــەزرێ [٤٧] . کۆنگــرەی ئەرزەرۆم دەروازەیەکی فراوانی ... ەم مستەفا کەمال و کەمالیەکان والاکرد بۆ ئەوەی کۆنگرەیەکی فراوانت ببەستن. هەر لەو پێ دانگــەوە مستەفا کــەمال داوای لــە رێکخــراوە میللیەکانی تەراقیاو ئەنادۆڵ کرد کەخ... بخەن بۆ ئەوەی کۆنگرەیـەکی گشـتی لـە سیواس ببەستن. کۆنگرەی سیواس لـە ئـەیلولی ١٩١٩ دا بەسترا چـەند گۆڕانێکـی لــە مەنهەجی کۆنگرە لـە ئـەرزە رۆمدا کــرد، ئــەو گۆڕانانــەش هــەمووی لەبــەرژەوەندی ناسیۆنا... ی تورکیدا بوو، وەك [٤٨] :

١. گۆڕینــی نــاوی کۆمیتــەی داکۆکــی کــردن لەمافــە... ...ی ئــەنادۆڵ (کوردستان) بۆ کۆمیتەی داکۆکی کردن لەمافەکانی ئەنادۆڵ و رۆملیدا.
٢. گۆڕینی ئەو بەندەی کە دەڵێت دەستەی نوێنەرایەتی دەستەی گشتی خۆرهەڵاتی ئەنا... ... نوێنێـت بـۆ دەسـتەی نوێنەرایـەتی دەسـتەی گشـتی نیشـتمان (تورکیـا) دەنوێنێت.

هەروەها لەکۆنگرەی سیواس دا هاتووە ئەو خاکــەی لــەنێو ئــەو سنورەدایە کــە مەرجەکــی ئاگربەســـتی ... نێـوان هاوپەیمانـەکان و ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی رێکەوتنی لەسەر کراوە، ئـەو هـەموو خاکانـە یـەکێتی تـەواو پێکدێنــن ناشــێ لەیــەك جیابکرێنـەوە [٤٩] . لەسـەر... کۆنگــرەی سیواسدا، میجـەر نۆئێلــی لۆرانســی کــوردە قەومیەکان لەگەڵ کامەران و جەلادەت بەدرخان و کەسانی دی قەومی گەشتێك بەهەندێ ناوچەی باشورو رۆژئاوای کوردستان کرد بەتایبەت عنتاب و مەلاتیـە. بـەجۆرێك مسـتەفا کەمال لە کۆنگرەی سیواس میجەر نوئیلی تاوانبار کرد بــەوەی کــوردان هـاندەدا شــۆڕش بەرپا بکەن. ئەوەی جێی سەرنج بێ ئەو چالاکیەی نۆئێلیش هەر بـۆ زیـاتر بـەهێزکردنی

کەمالیەت بوو، چونکە ناوچەی مەلاتیە کە بەناو بنکەی راپەرینە چاوەڕێکراوەکە بوو لەبەردەم سوپای کەمالیەت هیچی پێنەکرا. دووەمیش لە ۱۹۱۹/۹/۱۲ عەقید بیل خۆی هاتە مەلاتیە بە دەسەڵاتی تورکی راگەیاند کە حکومەتی ئینگلیز بەو چالاکیەی نۆئیل ئاگادار نیەو لەو بارەیەوە نۆئیل بۆ لێکۆلینەوە بانگ دەکرێ. سێیەم زۆربەی سەرکردە سوپاییو خێڵەکیەکان لەبەر چەند هۆیەك نەیاندەویست شۆڕش لە دژی کەمالیەکان بکەن:

١. خودی خۆیان باوەڕیان بەمەسەلەی سەربەخۆیی کوردستان نەبوو.

٢. ئەو شکستە عەسکەریو سایکۆلۆژیەی لەهەردوو زنجیرە شۆڕشی ۱۸۰٦-۱۸۸۰ و ۱۸۰۹-۱۹۱٤ توشیا ببوو باوەڕیان بەشۆڕشی کوردی لاوازببوو.

٣. لە رواڵەت بزوتنەوەی کەمالیەت بە تایبەتی لە دەسپێکی شۆڕشدا لادینی نەبوو، بەڵکو خەڵك بە خەلیفەی ئایندەی تێدەگەیشتن.

٤. لە دیدی سەرکردە خێڵەکیەکان بەرژەوەندی خێڵ لە سەرووی بەرژەوەندی باڵای میللەتدا بوو.

٥. ترس لە بزوتنەوەی لا دینی وەك کۆمۆنیست و ئەرمەنیو یۆنانی.

پاش ئەوەی مستەفا کەمال، پشتگیری ماددیو مەعنەوی عەشایەرە کوردەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی بەدەست هێنا، توانی سوپای حکومەتی ئەستەمبوڵ ببەزێنێو حکومەتێکی بەدیلی حکومەتی ئەستەمبوڵ لە ئەنقەرە دابمەزرێنێ بەمجۆرە لە ۱۹۲۰/٤/۲۳ ئەنجومەنی باڵای نیشتمانی تورکی بەئامادە بوونی ۳۸۰ نوێنەر لە ئەنقەرە کۆنگرەی خۆی بەست و بڕیاری لەسەر دامەزراندنی حکومەتی ئەنقەرە دا [٥] هەروەها تەشکیلاتی ئەساسی، کە بنەمای حکومەتی لادینی ئایندەی تورکیا بوو، بوو بەمەنهەجی کاتی حکومەتی ئەنقەرە. مستەفا کەمال لە بەردەم کۆنگرە بەراشکاوی وتی : سنووری

ئێمە هەموو ئەو شوێنانە دەگرێتەوە کە هاوکات لەگەڵ ئیمزاکردنی ئاگربەستی مۆدرۆس لە ژێر دەسەڵاتی سوپای ئێمەدابوو. هەروەها وتی نیازی یەکەم و بنەڕەتی ئێمە سنورەکانی خواروومان دیاری بکەین لە ئەسکەندەرونە بەرەو رۆژهەلات دەست پێدەکا لە ئاکامدا موسڵ، سلێمانی، کەکوکیش دەگرێتەوە، ئەوەیان سنووره نیشتمانیەکانمانن [٥١] ، بەڵام لەبەر ئەوەی شەیف پاشا نوێنەری ناسیۆنالە کوردەکان و بۆگۆس نۆباری نوێنەری ئەرمەنەکان وەك وەفدی کورد و ئەرمەن رێککەوت بوون و دوو یاداشتیان پێشکەش بە کۆنگرەی ئاشتی پاریس کرد بوو بۆ ئەوەی ئەنجومەنی باڵای هاوپەیمانەکان بڕیار لەسەر دوو حکومەتی ناسیۆنالی کوردیو ئەرمەن بدەن، ئەوە بوو لە ئابی ۱۹۲۰ هاوپەیمانەکان لەسەر کاغەز بڕیاریان لەسەر دوو حکومەتی ناسیۆنالی کوردیو ئەرمەنی دا. ئەو تاکتیکەی هاوپەیمانەکان مستەفا کەمالی تەنگاو کرد، کە ئەویش دان بە مافی کورددا بنێ،لەو بارەیەوە قاسملو دەڵێ: کەمالیەکان لە پەیمانی میساقی میللیی ژانویەی ۱۹۲۰ بەڵێنی ئەوەیان دابوو رێز لە کەمایەتی‌یەکان بگرن. هەروەها محەمەد ئەصلان لە نوسینێك بۆ گۆڤاری (بەرەو ساڵی ۲۰۰۰) تورکی بەڵگەنامەیەکی تورکی بلاوکردۆتەوە، بە گوێرەی ئەو بەڵگەنامەیە مستەفا کەمال بەڵێنی داوە کە حوکمی زاتی بەکوردەکانی تورکیا بدا لە پاش رزگارکردنی تورکیا [٥٢] . ئەمەو بۆ ئەوەی سەرکردە خێڵەکیەکان و عەسکەریەکان نەکەونە ژێر کاریگەری کوردە ناسیۆنالیستەکان و دەوڵەتی نێو پەیمانی سیڤەر، ئەنجومەنێکی حەفتاو دوو ئەندامی لە کوردان پێك هێناوە بەڵێنی حوکمی زاتی دانێو پێی وتن: تورکیا بریتی‌یە لە تورك و کورد، ئەو دوو میللەتە لە نێو سنووری ئەتنۆگرافی خۆیان سەربەخۆ دەبن، بەڵام سوپاو سیاسەتی دەرەوە، بەدەست حکومەتی مەرکەزی دەبێت [٥٤] . ئەو کوردانەش بە دیماگۆژیەتی مستەفا کەمال چەواشە بوون و تەلەگرافیان بۆ ولسن و کۆنگرەی ئاشتی دەکردو دەیانوت ئێمە کوردو تورك

براین نامانەوێ لە تورکیا جیا بینەوە ! ! بەمجۆرە پاش ئەوەی کەمالیەکان سوپای یۆنانیو بزوتنەوەی ئەرمەنەکانیان لە تورکیا بەدەرنا لەگەڵ هاوپەیمانەکان و سۆڤیەت ڕێککەوتن، بوون بە حکومەتێکی عەسکەری بەهێز، بەڕەسمی بڕیاریاندا کەهەموو دانیشتوانی تورکیا– بە کوردستان باکورەوەش– وڵاتی تورکانەوە ئەوەی تورك نەبێ تەنها مافی ئەوەی هەیە کە نۆکەری تورك بێ. هیچ نەتەوەو کەمە نەتەوە نابێ ناوی کورد یا ئەرمەن بێ. بە حوکمی ئەوەی حکومەتەکەیان لەسەر بنەمای لادینیو قەومی دامەزرابوو شانازیان بە رابردووی جاهیلی خۆیان دەکرد، هەتا نەتەوە کۆنەکان وەك هیسینەکان و سۆمەریەکانیشیان بە تورك دەزانی، لەهەموو بەڵێنەکانشیان سەبارەت بە چارەسەری دۆزی کورد لە حکومەتی ئایندە تورکیا پەشیمان بوونەوە، بەڵێنیان دا کە لەهەر جێیەك سەرە نیزەی تیرك هەبێ مەسەلەی کورد نییە ".

# پەراوێزو سەرچاوەكان


١. محسن العبيدي، التطورات السياسية الداخلية في تركيا ١٩٤٦-١٩٦٠، لا٦.

٢. كرۆنۆلۆژی پرسی موسڵ، وەرگێڕانی لە ئینگلیزیەوە سەلام ناوخۆش.

٣. محسن العبيدي ص٦.

٤. صبرية أحمد، الأكراد في توركيا، ص٨٤.

٥. گۆڤاری هیوا، ژ(٧) پاریس.

٦. ڕۆژنامەی ڕابوون ژ(٢).

٧. ضابط توركي سابق، الرجل الصنم و رابوون ژ (٢).

٨. موفق بن المرجة، صحوة الرجل المريض، ص٢٧٠.

٩. د. كمال مظهر، أضواء على قضايا دولية في الشرق الاوسط ص١٢٧.

١٠. د. عبدالله عزام، المنارة المفقودة، ص٢٢.

١١. ڕێبوار، كوردستان چۆن داگیركراو دابەش كرا، لا١٢.

١٢. ڕۆژنامەی ڕابوون ژ(٢).

١٣. مصطفى الزين، أتاتورك وخلفاءه، ص١٠٦.

١٤. محسن الزبيدي، ص٧.

١٥. ضبط تركي سابق، الرجل الصنم ص١٤٨ وعبدالله عزام المنارة المفقودة، ص١٢٣.

١٦. لازاريف، المسألة الكوردية، ص٢١.

١٧. سەرچاوەی پێشوو.

١٨. ڕەفیق حلمی، یاداشت.

١٩. محسن الزبيدي ص٧ ومصطفى الزين ص١٢٤.

٢٠. كرمانج گوندی، ٣٠ ساڵ خەبات و وڵاتێكی وێران.

٢١. حيدر كاظم، الأكراد من هم والى أين؟ ص٥٧.

٢٢. جورج لنشوفسكي، الشرق الأوسط في الشؤون العالمية، ج١، ت: جعفر الخياط ص٤٨.

٢٣. ٢٣. محسن العبيدى، ص١٣.

٢٤. عبدالله عزام، ص٢٢.

٢٥. جورج، ص١٥٠.

٢٦. قاسم عاصم جميل، العراق و الحركة الكمالية ١٩١٩-١٩٢٣ . ص١٢٨.

٢٧. لەپاش لابردن خەلیفە عبد ولحەمیدی دووەم، سێ خەلیفەی ڕەمزی کران بە خەلیفەی دەوڵەت، ئەویش محەمەد ڕەشاد (محەمەدی پێنجەم)، وەحیدەدین(محەمەدی شەشەم)، عبدولمەجید.

٢٨. عبدالرحمن حنبكة الميداني، اجنحة المكر الثلاثة، ص٣١٥-٣١٦.

٢٩. د. مصطفى حلمي، الاسرار الخفية وراء الغاء الخلافة العثمانية،ص٩٥.

٣٠. مذكرات السلطان عبد الحميد، ص٦٧.

٣١. منذر الموصلي، رؤية عربية للقضية الكردية، ٣٠٦-٣٠٧.

٣٢. ضابط تركي سابق الرجل الصنم و عبدالله عزام، المنارة المفقودة، موفق بن المرجة، صحوة الرجل المريض ص٢٦٨.

٣٣. قاسم عاصي الجميل، العراق والحركة الكمالية، ص١٢٨.

٣٤. د. عبد الرحمن قاسملۆ، كوردستان وكوردلا٥٩.

٣٥. ڕەفیق حلمی، یاداشت و خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا.

٣٦. موفق بنى المرجه، ص٢٧٠.

٣٧. لورانس العرب لزهدي فاتح،ص٧١-٧٢.

٣٨. گۆڤاری –رۆژی نوێ– سلێمانی ساڵی ١٩٦٠ هەروەها رۆژنامەی رابوون ژ(٤).

٣٩. رەفیق حلمی، یاداشت و ڕۆژنامەی ڕابوون ژ(٤)

٤٠. جەلال تەقی خەباتی گەلی كورد لە یاداشتەكانی ئەحمەد تەقیدا.

٤١. قاسم عاصي الجميل، العراق والحركة الكمالية.

٤٢. ضابط تركي سابق، الرجل الصنم.

٤٣. گۆڤاری رۆژی نوێ (١٩٦٠).

٤٤. ضابط تركي سابق، سەرچاوەی پێشوو، هەروەها ڕۆژنامەی رابوون ژ(٤).

٤٥. لازاريف، المسألة الكردية، ص١٣٢

٤٦. د. جمال نەبەز، دۆزی ناسیۆنالی كورد.

٤٧. عزيز الحاج، القضية الكردية في العشرينات،ص٢١.

٤٨. رۆژنامەی رابوون ژ(٤).

٤٩. لازاريف المسألة الكردية ص١٣٢.

٥٠. سەرچاوەی پێشوو ص١٣٠.

٥١. كرۆنۆلۆژیای پرسی مووسڵ، وەرگێڕان لە ئینگلیزیەوە، سەلام ناو خۆش.

٥٢. د.عبدالرحمن قاسملو، لا٥٨

٥٣. وصال نجيب عارف، القضية الكردية في تركيا ١٩٩٣، ص٢١٧

٥٤. گۆڤاری رۆژی نوێ، رۆژنامەی رابوون ژ(٤).

٥٥. د.عبدالرحمن قاسملۆ،لا٦١.

## ئینگلیزو دۆزی کورد

پێش ئەوەی فەرمانداریی ئیتحادیەکان جاڕی جەنگ لە دژی هاوپەیمانەکانەوە بدەن، هەریەکە لە حکومەتی ئینگلیزو رووسیای قەیسەری لە نێو خۆیان بەنهێنی بڕیاری لە نێو بردنی دەسەلاتی خەلیفەو ئیمپراتۆریەکەیان دابوو، ئەگەر بێتو لە جەنگدا بچنە پاڵ ئەڵمانیاوە - ئەو راستەیەش لەنامەیەکی سێر ئەدوارد گرای، وەزیری دەرەوەی ئینگلیز، هاتووە، ئەگەر بێتو دەوڵەتی عوسمانی لە جەنگدا بچێتە پاڵ ئەڵمانیاوە، ئەوا دەبێت لە نێو ببرێ [1] . ئینگلیز بەرەسمی لە تشرینی دووەمی ١٩١٤ جاڕی جەنگی داوە، رووسەکانیش هەر پێشتر باڵیۆزیان لە نێو ئیمپراتۆریەت هەبوو، بە حوکمی ئەوەی هاوسنوورو هاو بەرژەوەندی بوون لە گۆشە نیگایەکی سەلبییەو دەیانڕوانییە رەوتی جەنگە جیهانییەکەی ئیمپریالیزم. ئەو راگەیاندنەش خۆی لە خۆیدا دەروازەیەك بوو بۆ شوێن پێ توند کردنی دەسەلاتی صەلیبیەتی رۆژئاوا لە خۆرهەلاتی ئیسلامی داو هەروەها رەخساندنی بنەماو زەمینەیەکی لەبار بۆ هەلوەشاندنەوەی دەسەلاتی(ئیسلامی) لەناوچەکەدا.فرە نەتەوییو جودا ئایینی نێو ئیمپراتۆریەت مادەی سەرەکی ئەجیندای کرداری سەربازی هاوپەیمانەکان بوون، هەر بۆیە مەسەلەی داگیرکردنی فیکرییو ئاژاوەی تایەفەگەری ئایینیو نەتەوەیی خالێکیدی عەقلیەتی دەسەلاتی سیاسی داگیرکەرانی مەسیحیەتی رۆژئاوا بوو بۆ شوێن پێ توندکردنی دەسەلاتی سیاسییو عەسکەرییان لە ناوچەکەدا.

هەر بۆیە هاوپەیمانەکان بەر لەوەی دەوڵەت بگرن، لەرووی فیکرییەوە توانیان بەرهەڵستیو سەرهەڵدان لە نێو ئیمپراتۆریەت بەرپا بکەن. بەڵێ مەسەلەی گەلان خاڵێکی بنەڕەتی دیماگۆژیەتی میدیای هاوپەیمانەکان بوو. یەکەم راگەیاندنی هاوپەیمانەکانیش لەو بارەیەوە لە یاداشتێکدا هاتووە کە وەزیری دەرەوەی ئینگلیز بە پەلە لە (١٨) ی

كانونی یەكـەمی ١٩١٦ بـۆ ودرۆ ویلسـن ١٩١٣-١٩٢١ سـەرۆكی ئـەمریكایی نـاردووە. بـە گوێرەی دەقی یاداشتەكە، یەكێك لەئامانجە ستراتیژیەكانی هاوپەیمانەكان لـەو جەنگـەدا (دابین كرنی گەرەنتی سەربەخۆیی بوونی دانیشتوانانی ژێـر دەسـتەی تـیرۆری خوێنـاوی تورك بووە [٢] . ویلسنیش ساڵێك دوای ئەو یاداشتە، لـە ٤ی كـانونی یەكـەمی ١٩١٧، ئـەو راگەیاندنەیدا:

(ئومێدم وایە گەلانی نێو ئیمپراتۆریەتی توركی مافی خۆیان پێ بدرێت، ژیانێكی ئاشـتی ئاسایشـیان بـۆ دابـین بكرێـت. چارەنووسـیان لــە دوژمنـــان و ســتەم و داهاتــە سـەلبیەكانی كۆمپانیـایی دارایـی و پارتـە بێگانــەكان بپـارێزرێت) ئەمانــە مشــتێك لــەو راگەیاندنەی هاوپەیمانەكان بوون كە بۆ هاندانی گەلانی نێو ئیمپراتۆریەت بڵاودەكرانــەوە لە پەناوەش بە پێی پەیمانێكی نهێنی هەموو ئیمپراتۆریەتیان بە گوێـرەی بـەرژەوەندی عەسكەری و سیاسی و ئابووری خۆیانەوە لە نێو خۆ دابەش كردبـوو. ئـەو پەیمانـە كـە لـە مێژوودا بە پەیمانی سایكس- بیكۆ بەنێو بانگە، پاش رازی بوونی رووسیای قەیسەری لە ئـەیلولی ١٩١٦ دا شــەكلێكی رەسمــی وەرگــرت . هــەر دەوڵەتــەو بەشــێك لــەخاكی ئیمپراتۆریــەتی بۆخــۆ دانــا بــوو، بــە رەنگێكــی جیــاواز وەك ســنورێك لـــەوانی تـــر جیادەكردەوە، بەو شێوەیە ئەو شوێنەی لەسەر نەخشەكە ڕەنگی سـووری بـۆ دانرابـوو، ئەوا شوێنی دەسەڵاتی ئینگلیزی دەگـەیاند، كـە بەشـێوەیەكی سـەرەكی بریتـی بـوو لـە دۆڵی رافیدەین و ئەو ناوچەیـە لـە خانـەقینی كوردسـتانی باشـوور درێژدەبێتـەوە بـەرەو سەرەوە تاكو باشوری كوێت.ناوچەی دەسەڵاتی فەرەنساش رەنگی شـینی بـۆ دانرابـوو، ئەویش بە شێوەیەكی سەرەكی ئەو ناوچانەی دەگرتەوە كە ئێستا پێی دەڵێـن سـوریا و لبنان و هەروەها ولایەتی موسڵ. هەرچی ناوچـەكانی بـاكووری رۆژهـەڵاتی توركیـا بـوو- كوردستانی بن دەستی توركیا بۆ رووسیای قەیسەری دانرابوو. لە پاشان ناوچەیەكیش كە

رەنگی سەوزی بۆ دانرابوو، بۆ ئیتالیا بوو [٣] هاوکات لەگەڵ ڕەوتی رووداوەکانی بەرەی جەنگدا، هاوپەیمانەکان لەسەر سیاسەتی دووفاقی خۆیان هەر بەردەوام بوون، بە جۆرێك دەمێك بەجارێك (پەتای بەزین ) ورەی لەشکری ئیتیحادیەکانی ڕوخاندبوو، سەرەك ویلسن جارێکی تر کەوتەوە هاندانی گەلانی نێو ئیمپراتۆریەت ، لە ٨ ی کانونی دووەمی ١٩١٨ لە بەردەم کۆنگریسی ئەمریکیدا دەستورە چواردە بەندیەکەی سەبارەت بە سیستەمی نوێ ی جیهانی و ، بەرقەرارکردنی ئاشتی و ئاسایش و مافی گەلانی لە دیاریکردنی چارەنووسیان ڕاگەیاند ، ویلسن لە بەندی دوازدەهەمدا ، کە لەمەڕ تورك و نەتەوە غەیرە تورکەکانی نێو ئیمپراتۆریەت بوو ، بە شێوەیەکی ( شاراوە ) داوای سەربەخۆیی - خودی بۆ نەتەوە غەیرە تورکەکان دەکات هەروەك لە دەقی بەندەکەدا هاتوە :

(پێویستە گەرەنتی فەرمانڕوایی بۆ بەشەکانی تورکی لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا دابین بکرێت. ئەمما سەبارەت بەنەتەوە غەیرە تورکەکانی ژێر دەسەڵاتی تورك پێویستە ژیانێکی پڕ لە ئاسایش و دوور لەگومانیان بۆ دەستەبەر بکرێت و دەرفەتێکی رەهاو توندیشیان بۆ پەرەپێدانی (سەربەخۆیی–خودی– ئیستقلال زاتی– بۆ برەخسێت...) [٤] لەو لاش (مسیۆ جۆرج کلیمانسۆ) یەك لەچوار سەرکردە مەزنەکەی جیهانی ئەوسا بە ناوی دەوڵەتانی ئەورووپاوە شێلگێرانەتر بۆ مەسەلەکە دەچێت و دەڵێت: (تورکەکان زۆر بە ئاشکرا سەلماندیان، کە بەهۆی، بەڕێوەبردنی خراپیان و زۆرداری هەمەچەشنەیانەوە، لە چەندان سەدەدا توانای ئەوەیان نیەو شایستەی ئەوە نین رەگەزی نا تورك بەڕێوەببەن، بۆیە ئەگەر حاڵ وا بڕوات پێویستە نەیەڵین هیچ نەتەوەیەك لە ژێر دەسەلاتی تورك دا بێت) [٥]. ئەو سیاسەتە دووفاقیەی هاوپەیمانەکان هەر لەو بارنە بۆشەدا دەخولایەوە بە گوێرەی رەوتی رووداوەکان بەلایەك دا دەکەوتەوە.

دەمێك لە ٣٠ تشرینی یەکەمی ١٩١٨ ئاگر بەستی مۆدرۆس مۆرکرا، هاوپەیمانەکان بە تایبەتی ئینگلیز کەوتە خۆ بۆ داگیرکردنی شوێنە ستراتیژیەکانی ئیمپراتۆریەت. لەبەر رۆشنایی برگەی حەوتەمی ئەو ئاگربەستە کە رێ دەدات هەرچی شوێنێکی ستراتیژی گرنگ لەنێو ئیمپراتۆریەت هەبێت دەکرێت داگیربکرێت، هەر لەم رێگایەوە ولایەتی موسڵ داگیرکرا[٦]. ئەو داگیرکردنە شوومە شەقارێکی گەورەی خستە نێو جەرگەی کوردستانی عوسمانلی‌و رەوتی روداوەکانی بە ئارەزوو، وبەرژەوەندی عەسکەری‌و ئابووری‌و سیاسی ئینگلیز وەرچەخاند. ئەمە لەلایەك لە لایەکی دیش هێندێك ئەفسەری موخابەراتی ئینگلیز وەك میجەر نوئیل، هەردەمێك هەستیان بەخەتەری کورد کردبێت بەجارێك سیاسەتی ولأتەکەیان ئاوەژوو کردۆتەوە، دیماگۆژی خۆیان بۆ بەنجکردنی فیکرو عەقڵیەتی کوردی رزگاری خوازیان خستۆتە کارو، لێرەو لەوێ دەیانوت(مەبەستی ئێمە لەو جەنگە دژوارە ئەوە بوو، کەنەتەوە بچکۆلەو بێ دەسەلأت و بندەستەکان لە ژێر حوکمی بێدادو ستەمگەری دەوڵەتە زلهێزەکان رزگار بکەن.......)

ئەو دواکەوتنەی لەئاکامی داگیرکردنەکانی بەرایی‌دا بنجی لە عەقڵیەتی کوردی داکوتابوو، بەجارێك بۆشاییەکی فکری لە عەقڵیەتی سیاسی کوردا پێکهێنابوو. ئەو بۆشاییە سیاسیە لە بونیادی فکرو عەقڵیەتی رواڵەت عەشایەری دەسەلأتی کورد کە بەرژەوەندی خێڵەکی‌و کەسی لە پێشەوەی مەسەلەی نەتەوایەتیەوە دادەنا، زەمینەیەکی لەباری لەبەردەم چەکەرە کردن و فراژوو بوونی دیماگۆژی ئەمریمەنی مەسیحیەتی رۆژئاوا خولقاندبوو، هەرچی کۆمەڵە رووناك بیرەکەی فەرەنساو نێو پارتی ژۆن تورکەکان و، ئەستەمبوڵ ئەوانیش لە نێو خۆ ببونە چەند کۆمەڵێکی سیاسی‌و فیکرو ستراتیژ جیاواز: کۆمەڵێك بە تەواوی دەست بەرداری خەباتی چەکداری ببون، باوەڕیان وابوو دەبێت بۆ چارەسەرکردن کێشەی کورد دەستور لە رۆژ ئاوا وەربگیرێت، هەر لەو

روانگەیەوە ئەو كۆمەڵە، وەك نوێنەری كورد (سەردانی ئەو لیژنەیان كرد، كە دەوڵەتانی هاوپەیمان لە ئەستانە بۆ كاروباری داگیركردن.. یان پێكهێنابوو، چونە لای ئەو لیژنە ئەوروپایی و ئەفریقیانەش كە پێكهێنرابوون بۆ راوەرگرتنی ئەو گەلانەی كە قەڵەمڕەوی عوسمانی دەردەچن [٨] . لەبارەی ئامانجی ستراتیژی بزووتنەوەی رزگاری خوازیكوردیش، كەلێنێكی گەورە لە نێو ئەوكۆمەڵە رووناك بیرەدا دروست ببوو، بەشێك لەو كۆمەڵە كە دەستەی سەركردایەتی كوردستان (تەعالی جەمعیەتی) بوون وەك شێخ عبدولقادری عوبەیدولای شەمزینیوئەمین عالی بەدرخان، باوەریان بە(سەربەخۆیی) كوردستان هەبوو بەڵام بەمەرجێك لە نێو (یەكێتی عوسمانی) بێت! هەر لەو بارەیەوە شێخ عبدولقادر لە رۆژنامەی (تەصویری ئەفكار)دەڵێت: بە راستی ئەوە كارێكی زۆر هەڵەیە كە كورد هەڵوێستی بێ لە تورك جیابێتەوە. ئەمین عالی بەدرخانیش بەم شێوەیە بۆ رۆژنامەی(بۆسفۆر) دەدوێت: (ئێمە سوڵتانی عوسمانی هەر بەخەلیفە دەناسین وداوای جودایی ناكەین، جا بەهەرچەشنێك بێت ئێمە دەمێنینەوەو لەگەڵ ئەوان دەبین) [١٠] هەرچی سەركردایەتی پارتی دیموكراتی كورد بوو باوەڕی بە سەربەخۆیی كوردستان بوو. لەم بارەیەوە نەجمەدین حوسین، سكرتێری (پ.د.ك) نامەیەك بۆ دەسەڵاتدارانی ئینگلیز دەنێرێت و دەڵێت: (مافی سەربەستی گشتی لە ناوچەی كوردستانا بۆ كوردان كارو كردەوەیەكی تەبیعیو نەتەوایەتیيە...) [١١] حكومەتەكەی ئەستەمبوڵ هەر بۆئەوەی كوردان لە هاوپەیمانەكان دوور خاتەوە هەروەها درزی نێوان رێكخراوە كوردییەكان فراوانتر بكات بریاری ئەوە دەدات لە گەڵ دەستەی (ك.ت.ج)ی شێخ عبدولقادر دانوستانێكی كاتیی ساز بدات. (خەلیفە وەحیدەدین) خەلیفەی حكومەتی ئەستەمبوڵ،داوای لە ئیبراهیمی حەیدەری شێخی ئیسلامی دەوڵەتی عوسمانی كرد (لیژنەیەكی وەزاری) بۆ لێكۆڵینەوە لە كێشەی كورد پێك بهێنێت. لەئاكامدا هەردوولا بۆ

گفتوگۆ کۆبوونەوە لیژنە دوو قۆڵیەکە بەم شێوەیە بوو: نوێنەرانی دەوڵەت ئەمانەبوون: شێخی ئیسلام حەیدەری زادە ئیبراهیم ئەفندی وعەبوق پاشای سەرپەرشتیاری(ئەشغال)، عەونی پاشای سەرپەرشتیاری زەریا.ئەندامانی (ك.ت.ج) کۆمەڵەی بەرزێتی کوردستان - ئەمانە بوون: شێخ عبدو لقادری شەمزینی سەرۆکی کۆمەڵەو ئەمین عالی بەدرخان جێگری سەرۆك، مراد بەدرخان و مەولانا زادە رەفعەت و دوو ئەندامی ئەفسەری کورد، سەرهەنگ ئەمین بەگ و سەرگوردعەونی بەگ [١٢].ئەو لیژنەیە ئیبراهیم حەیدری وەکیلی سەرۆك وەزیرانی حکومەتی ئەستەمبوڵ سەرۆکایەتی دەکرد، لە کۆتاییدا لیژنەکە پرسیاری لەسەر ئەو خاڵانە دا:

١. سەربەخۆی بدرێ بە کوردستان، بە مەرجێك کورد قایل بێت هەر لەیەکێتی عوسمانیدا بمێنێتەوە.

٢. هەموو ئەدارەکێکی پێویست بۆ ئەم سەربەخۆییە جێبەجێ بکرێت بە گورجی دەست بکرێ بەئەنجام دانی.

ئەو رێکەوتنەی ئەستەمبوڵ و کورد هەر لەسەر کاغەز مایەوە هۆی سەرەکیش لەمەدا دوو شتی سەرەکی بوون:

یەکەمیان: چارەسەر کردنەکە بە ئارەزووی ئینگلیز نەبوو، هەربۆیە لە لایەك ئەو حکومەتە دەستکردەی خۆی روبەرووی بزوتنەوەی موستەفا کەمال کردەوە لە لایەکی دیش کارتی سەوزی بە یۆنان دا کە خوارووی تورکیا داگیربکات. دووەمیش، تورکەکان هەر خیان جدی نەبوون لەو بڕیارەیاندا بە جۆرێك هەرماوەیەك دوای ئەو رێکەوتنە لە رۆژنامەی (وقت) هەندێك پروپاگەندەیان بلاوکردەوە گوایە کورد بەمە رازی نەبووەو داوای جیابوونەوەی کردووە.لەنێو گەرمەی رووداوەکاندا هاوپەیمانەکان خەریکی دامەزراندنی دەزگایەکی نێو دەوڵەتی بوون بۆ ئەوەی ششەرعیەتێك بدەنە پاڵ پاراستنی

بەرژەوەندی عەسکەریو ئابوریەکانیان لە رۆژهەلاتی ناوەراست. لە ئاکامدا لە ٢٥ کانونی دووەمی ١٩١٩ کۆمەڵەی گەلان دامەزرا. هەفتەیەك بەر لەدامەزراندنی کۆمەڵەی نێو براو، هاوپەیمانەکان کۆنگرەیەکی ئاشتییان لە پاریس لە بارەی دابینکردنی مافی گەلانی بن دەست و کێشەی ناوچەییو هەرێمی نێو نەتەوەییەکان بەستبوو. پاش ئەوەی کۆمەڵەکەی شێخ عبدولقادر هیچیان لە حکومەتی ئەستەمبوڵ دەستگیر نەبوو. لە گەڵ هەندێك رێکخراوو پارتی سیاسیو دەسەڵاتداری کورد وەك کۆمەڵەی رێکخراوی کۆمەڵایەتیو کۆمەڵەی سەربەخۆی کوردستان و پ.د.ك رێککەوتن، کە شەریف پاشای سیاسەتمەداری کورد بۆ کۆنگرەی ئاشتی لەپاریس بنێرن، شەریف پاشا کۆنە باڵیۆزی عوسمانی بوو لە ستۆکهۆڵم لە ساڵی ١٨٩٠ ، لە سەردەمی ئیتحادیەکانیش ماوەیەك لەفەرەنسا بووە، هەر بۆیە ئەو کۆمەڵانە رێك کەوتن کە (شەریف پاشا) بکەن بە نوێنەری کوردو داوای مافی کورد بکا، لە کۆنگرەی ئاشتیدا شەریف پاشا لە ٢٢ مارسی ساڵی ١٩١٩ یاداشتێکی بە پێزی لە بارەی مێژوو جوگرافیای کوردستان و رەوایەتی دۆزی کورد ئاراستەی کۆنگرەی ئاشتی کرد. ئەرمەنەکانیش کەبە فیتی کۆمۆنیستەکانی سۆڤیەت ئیدعای دەوڵەتی ئەرمێنیای گەورەیان دەکردو دەیانویست بە شێك لە خاکی کوردستان بۆ خۆ دابڕن بە بیانوی ئەوەی ئەو ناوچانە لە کۆندا ولاتی ئەرمەنیەکان بووە [١٤].

شەریف پاشا بۆ چارەسەرکردن ئاشتیانەی کێشەی ئەرمەنەکانیش لە گەڵ بۆگۆس نوبار، نوێنەری ئەرمەنیەکان کۆبونەوەیەکی سازکردو لە تشرینی ١٩١٩ رێککەوتن کە کوردستان جیا بێت لە دەوڵەتی ئەرمینیای مەزن، هەربۆیە هەردوك پێکەوە لە یەکی ئاداری ١٩٢٠ یاداشتێکیان لەو بارەیەوە ئاراستەی ئەنجومەنی باڵای هاوپەیمانەکان کردو، ئەمەو لە یانزەی ئابی ١٩٢٠ ئەنجومەنی باڵا پەیمانی سیڤەر راگەیاند. ئەو پەیمانە لە مێژووی نوێی کوردا بە پەیمانێکی چارەنوسی ناو دەبرێت. لەبەشی سێیەمی ئەو

پەیمانەدا سێ بەند ٦٢،٦٣،٦٤ لەبارەی وڵاتی کوردان و دەوڵەتی ئایندەی کوردی بوون [١٥].

بە قەناعەتی ئێمە ئەو پەیمانە لە مێژوودا زیاد لە پێویست پێی هەڵدراوە، هەربۆیە ئێمش دەمانەوێت بە کورتی لێی بدوێین و هەڵوێستی شاراوەی هاوپەیمانەکان لەسەر هەدەفی بنەڕەتی روون بکەینەوە. بە پێی بەندی ٦٤، هاوپەیمانەکان بەرەچاوکردنی باری سیاسیو عەسکەری ناوچەکە، سێ مەرجی بنەرەتیان بۆ سەربەخۆی بەشێکی کوردستان دانابوو هەروەك لە دەقی بەندەکەدا هاتووە:

١. ئەگەر زۆربەی ئەو خەڵکانەی کەوتونەتە خۆرهەڵاتی فورات و باشووری خۆرئاوای ئەرمینیاوە داوای جیابوونەوە لە تورکیا بکەن.

٢. وە کۆمەڵەی گەلانیش لەو باوەرەدابێت کە ئەم گەلە ئەتوانێ سەربەخۆییو پێسپێری ئەمە بکات، ئەوا تورکیاش لە ئێستاوە پەیمان دەدات ئەو پێسپێریە جێ بەجێ بکات، دەست بەرداری هەموو ماف و ئیمتیازاتێکی خۆی ئەبێ لەو ناوچانەدا ..

٣. ماوەی ساڵێکیش بۆ پیادەکردنی ئەم بەندە دانرا...

ئەو سەربەخۆییەی لە بەندەکەدا هاتوو تەنیا سەربەخۆیی کوردستانی باکوورو رۆژئاوا بووە، چەنکە لەرووی پراکتیکەوە بەشی باشورو رۆژهەلات بەزۆری لەژێر دەستی سوپای ئینکلیزو دەسەلاتی عەرەب و فارسدا بووە، تاکو شەریف پاشا خۆیشی نەیتوانیوە لەوەندە زیاتر داوا بکات، هەروەك خۆی بۆ کلیمانسۆی سەرۆکی کۆنگرەی ئاشتی پاریس دەدوێت، داوای تەواوی کوردستان و مافی کورد ناکەم، بەڵکو تەنیا مەبەستم سەربەخۆیی ناوچەی دیاربەکر، خارپوت بەتلیس، موسڵ، کۆیسنجق و ئورفایە... دەنا مەسەلەی کوردو کوردستان لە ئەرزەرۆم را تا کوردی ئێرانیش

دەگرێتەوە، لە لایەك دیش، ئینگلیز بۆ ئەوەی قەوارەی مەسەلەکە بچووك بکاتەوە نە ڕێی بە نوێنەری حکومەتی کوردستانی باشووردا، کە بەڕێزان ڕەشید زەکی بابان و ئەحمەد بەرزنجی بوون، یاداشتێك لەبارەی کوردی باشورەوە بگەیەننە شەریف پاشا، نەڕێی بە کوردەکانی بن دەستی ئێرانش دا یاداشتێك لەبارەی خۆیانەوە بگەیەننە کۆنگرەی ئاشتی. سەبارەت بەم هەڵوێستە ئینگلز بیانووی ئەوە بوو ئێران بەشداری جەنگی نەکردوە، هەر بۆیە نابێت وەفدی کوردەکانی ئەوێ بەشداری کۆنگرەی ئاشتی بکەن! خاڵێکی دی لەسەر جیدی نەبوونی هاوپەیمانەکان ئەوەیە. ئەوان زۆر زیرەکانە دیراسەی بونیادی کۆمەلایەتی‌و فیکری کۆمەڵی کوردەواری‌و عەقڵیەتی سیاسی کوردیان کردبوو، دەیان زانی سەرانی وەك شێخ عبدولقادرو ئەمین عالی بەدرخان و ئیحسان نوری پاشاو حەسەن خەیری نایانەوێت لە یەکێتی عوسمانی دەربچن،هەر بۆ نمونە ئەو ئەنجومەنە ٧٢ ئەندامەی مستەفا کەمال دایمەزراندبوو بەناوی کوردەوە بۆ سەرۆك ویلسن و کۆنگرەی ئاشتی تەلگرافیان لێدەدا دەیانوت (ئێمە سەربەخۆیی کوردستانمان ناوێت، برایەتی کوردو تورکمان دەوێت)[١٦]. هەروەها خاڵێکی دی زۆر گرنگ لەسەر جیدی نەبوون لەسەر ناوەڕۆکی پەیمانەکەدا ئەوە بوو هەریەکە لە بەریتانیا، فەرەنسا، ئیتالیا لە هەمان ڕۆژی ڕاگەیاندنی پەیمانی سیڤەردا ١١-ئاب- ١٩٢٠ بڕیاریان لەسەر دابەشکردنی دەسەلاتی عەسکەری دا لە کوردستانی باکووردا[١٧]. ئەمەو ئینگلیز بۆ ئەوەی بە جارێك بەرژەوەندی خۆی لە ناوچەکەدا بپارێزێت دبلۆماسیانە لە کۆنگرەی سان ریمۆ ١٩٢٠ ولایەتی موسڵ - کوردستانی باشوری - بە جارێك بۆ خۆی دابڕی! ئەو ماوەی ساڵەش کە بۆجێ بەجێ کردنی بەندەکەدا بڕیاری لەسەر درابوو مەسەلەیەك بوو پەیوەندی بە ڕەوتی ڕوداوەکانەوە هەبوو. هەر بۆ نمونە دەمێك لە ساڵی ١٩٢١ مستەفا کەمال توانی زەبرێکی کوشندە لە حکومەتی ئەستەمبوڵ و سوپای داگیرکەری یۆنان لە باشوری

تورکیا بدات و هێڵێکی راست و چەپ بە کۆنگرەی لەندەن ٢١ - شوبات -١٤- ئازاری ١٩٢١ دا بدات بەجارێك مەسەلەکە ئاڵۆز بوو. هەریەکە لەفەرەنساو ئیتاڵیا و یەکێتی سۆڤیەت کەرەسەو کەل وپەلی جەنگی نوێیان پێشکەش بە بزوتنەوەکەی مستەفا کەمال کرد[١٨] ، دەسبەجێش رەزامەندی خۆیان راگەیاند سەبارەت بە گۆرینی ئەو بەندانەی پەیمانی سیڤەر کە باسی کوردستان دەکات، سێر هێنری ویلسن -ی سەرۆك ئەرکانی سوپای ئینگلیزیش لەو بارەیەوە دەنوسێت: (لە بەردەم دیبلۆماسی ئینگلیز یەك شت هەیە، ئەویش پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ مستەفا کەمال ببەستێت)[١٩] ، هەروەها سێر چارلس هارکنتون-ی سەرکردەی سوپای ئینگلیز لە ئەستەمبوڵیش دەڵێت: (باشترین شت بۆ ئێمەی ئینگلیزی ئەوەیە ئەستەمبوڵ بەجێ بهێڵین و لەگەڵ مستەفا کەمال پەیوەندی دۆستایەتی سازیدەین)[٢٠] ئەو پشتگیریە مەعنەویو ماددیەی هاوپەیمانەکان بۆ بزووتنەوەکەی مستەفا کەمال راپەرینی قۆچ گیرەکان پێ سەرکوت کراو،لە ئەیلولی ١٩٢٢ کۆتایی بە داگیرکردنی باشوری تورکیا لە سوپای یۆنانی هێنا. بەو شێوەیە ئەو پەیمانەی تەنیا لەسەر کاغەزیش ئەرمەن زۆر لە کورد زیاتری پێ رەوا بینرابوو بە جارێك لەنێو بەرژەوەندیەکانی هاوپەیمانەکاندا لە باربرا.

لەدوای ئەو روداوە شەڕی دەروونی، دبلۆماسی راگەیاندن بۆ ماوەی یەك دوو ساڵێك ناوچەکەی تەنیەوە . هاوپەیمانەکان خەریك بوون سەر لەنوێ نەخشەی جیهان بە پێی بەرژەوەندیەکانی خۆیان دابڕێژنەوە، هەر بۆیە جارێ پەیمانێکی ئاشتی نوێیان لە لۆزان راگەیاند. ئەگەر پەیمانی سیڤەر سێدارەی تورکیا بوبێت. ئەوا پەیمانی لۆزانی ٢٣ی تەموز ١٩٢٣ سێدارەی پەیمانی سیڤەرو نەخشەی رەتکردنەوەی ناسنامەی قەومی کوردو کوردستان و دۆزی کورد بوو! ئەو هەڵوێستە دوو فاقیەی هاوپەیمانەکان بەتایبەتی ئینگلیز هەر هەرێمی کوردستانی باکوری نەگرتبۆوە بەڵکو هەڵوێستێکی گشتگیر بوو

سەبارەت بە کوردەوە. بەڵێ هەر ئەوان بوون بە ڕەسمی شێخ مەحمودیان بە (حوکمداری)ی کوردستان دادەناو بەجۆرێك مەلیکی بەریتانیا جۆرجی پێنجەم خۆی پیرۆزبایی لە حکومەتەکەی شێخ مەحمود کردووە، هەروەك لە دەقی بەرقیەیەکی مەلیك لە ڕێگای باڵیۆزی ئینگلیز بە شێخ ڕاگەیاندراوە: (ئێمە تەبریکی سەعادەت و ئیستقلالیەتی کوردستان دەکەین. ئومێد ئەکەین دۆستایەتیمان هەر لە زێدەیی بێت. ئیمزا مەلیکی بەریتانیای گەورە جۆرجی پێنجەم) [21] هەروەها لە ٢٤ کانونی یەکەمی ١٩٢٢ بەریتانیاو حکومەتی عەرەبی عێراقی بەیاننامەیەکیان سەبارەت بە دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی لە باشوری کوردستان بلاوکردەوە. لە دەقی بەیاننامەکەدا را هاتووە (حکومەتی بەریتانیای خاوەن شکۆو حکومەتی عێراق دان بە مافەکانی کوردە نیشتەجێکانی سنووری عێراق دادەنێن لە دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی لەو شوێنانەی کە کوردەکان زۆرینەی ڕەهای دانیشتوان پێك دەهێنن...) ئەو هەموو بەڵێن و پەیمانانەی ئینگلیز تەنیا خافلاندن و چەواشەکردنی ڕەوتی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو قۆزتنەوەی (کات) بوو، ئەگەر نا شتێك نەبوو لە فەرهەنگی هاوپەیمانەکاندا پێی بوترێت حکومەتی کورد، هەر بۆیە هەروەك چۆن لە تەموزی ١٩٢٣ دەوڵەتە خەیاڵیەکەی نێو پەیمانی سیڤەر لە باربردرا هەر لە هەمان مانگ و ساڵدا مەسەلەی حکومەتەکەی باشوری کوردستانیش بووە (زۆرە ملی نەکردن لە بەکارهێنانی زمانی عەرەبی لە شارۆچکەکانی (باکوری عێراق)دا [22].

بەم شێوەیە بە پێی پەیمانی سان - ریمۆ ١٩٢٠ و پەیمانی لۆزانی ١٩٢٣ ولایەتی موسڵ بە هەردوو ولایەتی بەسرەی شیعەوە بەغدای عەرەبی سوننی لکێندراو، دەسەلاتی ڕەهای دەوڵەتی زۆرە ملێی بەناو عێراقیش خرایە ژێر دەستی عەرەبی سوونی کە تەنیا ١٥٪ هەر سێ ولایەتەکەیان پێکدەهێنا! ئەمەو لە ٣٠ تشرینی یەکەمی

## کوردستان چۆن داگیر کراو دابەشکرا

۱۹۲۳ مستەفا کەمال جاڕی سیستەمی کۆماری تورکیای داو، بەشــی بـاکوری کوردسـتان بە ڕەسمی کرایە ویلایەتەکانی باکوری ڕۆژهــەلاتی تورکیـا. هـەرچی فەرەنساش بـوو بـە پێی سێ پەیمانی شووم: سـایکس بیکۆ ۱۹۱٦، سـان ریمـۆ ۱۹۲۰، لۆزان ۱۹۲۳ بەشـی خۆرئـاوای کوردسـتانی تـاکو سـالّی ۱۹٤٦ خسـتە ژێـر ئینتدابـی خۆیـەوەو بەشـی ڕۆژهەلاتیش، کوردستانی بندەستی‌ئێران هەر لەسالّی ۱٦۳۹ - ەوە لە ژێر دەستی ئـێران دابوو تـاکو ئـەمرۆش لـە ژێـر پۆسـتالّی فارسـدا دەنـالّێنێت، لـە (٥)ی حوزەیرانـی ۱۹۲٦ وەفدی تورکیا لە کۆنگرەی سـێ قۆڵـی ئەنقـەرە بـە ڕەسمـی دانـی بـەهێڵی (بڕۆکسـل)ی کۆمەڵەی گەلان ناو، لە ۱۸ تەموزی ۱۹۲٦–ەوە ئەو هێڵە بە ڕەسمی بۆتە سنووری نێـو دەولّەتی نێوان تورکیا و عێراق. لـەو چـەند دێـرە دا بـە ئاشـکرا دەردەکـەوێت کـە چـۆن هاوپەیمانـەکان کوردسـتانیان داگـیرکردو دابەشـکردو چـەند حکومـەتێکی ناسیۆنالیسـتی کۆنەپەرستیان لەسەر حسێبی دۆزی ڕەوای کورد دامەزراند، بەلاّم دەمێـك سـەرانی کـورد یەك و لە ژێر یەك ئالاّ کۆدەبنەوە ئەو هێڵە دەستکردەی ئیستعمار هەر هێنـدەی دیـواری بـەرلین خـۆی لەبـەردەم ڕقـی پـیرۆزی کـورد رادەگرێـت.هــەروەك W.H.Hay ئەفسـەری موخابەراتی ئینگلیز لە لاپەرە (۳٦)ی پەرتوکی (دوو سالّ لە کوردسـتان)دا ئـەو ڕاسـتیە بەلّگە نەویستە دەنوسێت: (ئەو ڕۆژەی کە کوردەکان لە خـەوی غەفڵـەت بێـدار دەبنـەوە ستراتیژیەتێکی نەتەوەیی یەکگرتوو دادەڕێژن، ئیدی دەولّەتەکانی تورکیا، ئێران، عـێراق تەنانەت هێزی پوشکەیەکیشیان نامێنێ).

# پەراوێزەکان

٢. د.كمال مظهر، اضواء على قضايا دولية في الشرق الاوسط، ص١٢٧

٣. سەرچاوەی پێششوو

٤. د.جرجيس حسن، تركيا في الاستراتيجية الامريكية بعد سقوط الشاه، ص٨٢ - ٨٣

٥. د.كمال مظهر، نفس المصدر ص٥٥، ئەو (استقلال ذاتي)یەی ولسن جاڕی بۆ دەدا خۆی لە خۆیدا ئۆتۆنۆمی‌یەکی راست و دروست بوو، نەك سەربەخۆیی، مامۆستا جەمال نەبەز لە کتێبێکدا دەقی ئەو بەندە بەو شێوەیە دەنوسێت: ویدرۆ ولسن دوای دەستەبەری مافی ئۆتۆنۆمی بۆ نەتەوە غەیرە تورکەکانی ژێر دەستەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەکات.

٦. د. بلەچ شێرکۆ، کێشەی کورد ل٦٥.

٧. عەلی ئیحسان پاشای فەرماندەی لەشکری شەشی عوسمانی لە موسڵ مۆڵی دابوو هەر بەرهەڵستی سوپای ئینگلیزی دەکرد، بەڵام ئینگلیز سوور بوو لەسەر ئەوەی هەر دەبێ موسڵ داگیر بکرێت چونکە شوێنێکی ستراتیژی گرنگەو چەندین کێڵگەی نەوتی لێیە. لەوبارەیەوە مارشاڵی سوپای ئینگلیز نامەیەکی هەڕەشە ئامێز بۆ عەلی ئیحسان پاشا دەنوسێت و دەڵێت: ئەگەر لە پازدەی تشرینی دووەم موسڵ تەسلیم نەکەیت، ئەوا تەنیا تۆ بەرپرسیار دەبیت لە هەموو خوێنێك کەلە داهاتوودا دەرژێت. لە ئاکامدا بەو شێوازە دیبلۆماسی‌یە ئینگلیز لە ٨ی تشرینی دوەمدا موسڵی داگیرکرد. ئەو داگیرکردنەش خاڵێکی رەش بوو، بۆ چارەنووسی کوردستانی باشوورو ئەمرۆشی لەگەڵدا بێت هەڕەشەکەی مارشاڵی ئینگلیزی هەر کاریگەری خۆی ماوە لە سەر رەوتی رووداوەکانی کوردستاندا.

٨. کوردستان عوسمانلی: کوردستانی بندەستی تورکیا ، عێراق و سوریا کە بە پێی پەیمانی زەهاوی ١٦٣٩ بە دەوڵەتی عوسمانی بەخشرا!

٩. د.بلەچ شێرکۆ، سەرچاوەی پێشوو ل٦٣.

١٠. کریس کۆچێرا، مێژووی کورد لە سەدەی ١٩– ٢٠ ل٧٠.

١١. سەرچاوەی پێشوو ل٦٩.

١٢. سەرچاوەی پێشوو ل٦٩.

١٣. د. بلەچ شێرکۆ، سەرچاوەی پێشوو.

١٤. د. کمال مظهر، چەند لاپەرەیەك لە مێژووی گەلی کورد.

١٥. ئەرمەنەکان ئیدعای ئەوەیان دەکرد کە هیچ مەڵبەندێك لە جیهاندا بەقەد مەڵبەندەکانی وان و بەدلیس ئەرمەنی ئین! هەروەها سەبارەت بە نێو (مافی مێژوویی) ئەرمەن بەسەر کوردستانەوە لە تۆماری ئەرمەنییەکان هاتووە ئەو نیشتمانە (کوردستان) چەندین سەدەیە نەتەوەیەکی لەسەر دەژی وەکو ئێمەی ئەرمەن لە رەگەزی ئارین و ئێمەش هەست دەکەین کە ئەو نەتەوەیە زیاتر لە ئێمەوە نزیکن وەك لە تورك، بەڵام هێندە بەشێکی ئەو نیشتمانەیان - خۆ هەربەدەستی ئەرمەنییەکانی چاخە کۆنەکانیش ئاوەدان کراوەتەوە - ئەمڕۆ بەزۆری بە ئیسلام کراوە و بکورد کراوە!

١٦. شەریف پاشا بۆ پوچەڵکردنەوەی ئەو داوایەی ئەرمەنییەکان بەڵگەی مێژوویی دەهێنێتەوە بە گوێرەی ئینسکلۆپیدیای ئینگلیزی (Nutlas) نەخشەی خاکی ئەرمەن بەو شێوەیە یە ئەرمینیا ولاتێکە لە رۆژئاوای ئاسیادا. کەوتۆتە دەریای قەزوینەوە، لە باکوری چیاکانی کوردستاندا. دابەش کراوەتە سەر تورکیا و رووسیا

ولاّتی فارس، دەشتێکی شەقار - شەقار پێکدەهێنێ‌و ئەملاو ئەولای چەند دۆڵێکی بە پیت و پاراون کە لوتکەکانیان لە چیای ئارارات قوت دەبنەوە.

١٧. پەیمانی سیڤەر پێنجەم پەیمانی نێو دەوڵەتی بوو کە کۆنگرەی ئاشتی پاریس بڕیاری لەسەر دابێت. ئەو پەیمانە لە ١٣ بەش و ٤٣٣ بەند پێکهاتبوو. پێنج لێژنەی تایبەتی سەر بە کۆنگرە دایان رشتبوو.

١٨. ئەو هەڵوێستەی ئەنجومەنی حەفتاو دوو ئەندامی کوردی، هەڵوێستێکی نابەجێ‌و خۆفرۆشانە بوو چونکە لە راستی‌دا لە بواری سیاسی‌و عەسکەری‌دا خزمەتێکی زۆری بە بزووتنەوەکەی مستەفا کەمال کرد، زەبرێکی سیاسیشی لە هەڵوێستی کوردا دا، عصمەت ئینۆنۆی وەزیری دەرەوەی ئەوکاتی تورکیا لە کۆنگرەی لۆزان دا دەربارەی هەڵوێستی ئەو جۆرە کوردانە دەڵێت: لە مێژوودا پیشانیان داوەو ئەوەیان سەلماندووە کە دەیانەوێ لە ژێر بەرێبەرایەتی تورکدا بژین و لەوان جیا نەبنەوە. ئەو ئەندامانەی کە کوردن و تاکو ئێستاش لە پەرلەمانی ئێمەدا جێگیر بوون ئەوا نوێنەری گەلی کوردن. ئاسۆ گەرمیانی: کورتە مێژووی کوردو کوردستان ل٦٤.

١٩. ئەو بەشەی کوردستان بەپێی پەیمانی سایکس-بیکۆ بەشی رووسیا بوو بەلاّم دوای کودەتای سووری سۆڤیەتی، بەلشەویەکان شوێنەکەیان چۆلکردو لە گەلّ ئیتحادی‌یەکان رێککەوتن، بە پێی پەیمانی برێست- لیتۆفسک - ئاداری ١٩١٨ بەشێکی سنووری کوردستان بۆخۆیان دابڕن ئەو چەشنە سنورەش دوایی بوو بە سنووری رەسمی سۆڤیەت و تورکیا!

تەنیا یەکێتی سۆڤیەت ملیۆنێك رۆبڵی زێڕو ٣٩هەزار تفەنگ و ٦٣ ملیۆن فیشەك و ٥٤ تۆپ ٢٠ هەزار ماسکی دژی کیمیایی‌و زەخیرەو نەفتێکی زۆری کردە خەلاّتی تورکیا، هەرچی فەرەنساش بوو هەرچی چەك و تەقەمەنی هەیە لەو شوێنانەی بۆ

١. لەشکرە میللی‌یەکەی مستەفا کەمالی چۆڵ دەکرد دبلۆماسیانە پێی دەبەخشی بەم جۆرە ئەو چەك و تەقەمەنی‌یەی لەشکری فەرەنسی لە کلیکیا بەجێی هێشت لەگەڵ ئەوەی رووسی بەس بوون بۆ ئەوەی چۆك بە سوپای وەحیدەدین و یۆنانی‌و قۆچ گیری‌یە شۆرشگێرەکان دابدەن!

٢٠.الرجل الصنم: ضابط تركي سابق

٢٠.رۆژنامەی خەبات.

٢١.المسألة الكردية في العراق: عزيز شريف.

## سەرچاوەکان


١. د.بلەچ شێرکۆ، کێشەی کورد مێژینەو ئێستای کورد، تەبرێز ١٩٩٠

٢. د.كمال مظهر أحمد، اضواء على قضايا دولية في الششرق الاوسط، بغداد ١٩٧٨

٣. د.کمال مەزهەر، چەند لاپەرەیەك لە مێژووی گەلی کورد، بغداد ١٩٨٥

٤. کریس کۆچیرا، مێژووی کورد لە سەدەی ١٩-٢٠دا ، و: محمد ریانی، تاران ١٦٣٩

٥. د. جەمال نەبەز. بیری نەتەوەیی کورد نە بیری قەومی رۆژهەڵاتی‌و نە بیری ناسیۆنالیزمی رۆژئاوایی‌یە، ستۆکهۆڵم ١٩٨٤

٦. الرجل الصنم، ضابط تركي سابق، ت: عبدالله عبد الرحمن ط٢،؟١٩٧٨

٧. گۆڤاری رۆژی نوێ

٨. گۆڤاری رابوون ژ:٢

٩. . رۆژنامەی خەبات.

پێش ئەوەی لە پەیمان لۆزان بکۆڵینەوە، وا بەچاك دەزانین ئەو هۆکارانە بخەینە روو کە دەوری گرنگیان بینی لەتەواو ئاشکراکردنی ماهیەتی پەیمانی سیڤەرو دروستکردنی پەیمانی لۆزان:

## یەکەم: پاڵپشتی رۆژئاوا بۆ کەمالیەت

هەر کە لەشکری کەمالیەت لە دوای سیڤەر، چەند سەرکەوتنێکی بەدەست هێنا، تەواو ماهیەتی ستراتیژیەتی رۆژئاوا لەبەرامبەر بزوتنەوەی کەمالیەت و دۆزی کورد بەدەرکەوت. هەربۆیە پێش ئەوەی پەیمانی ئاشتی لە لۆزان ئیمزا بکەن لە چەند کەناڵێکەوە پەیوەندی راستەوخۆی دبلۆماسیو عەسکەریان دەگەڵ حکومەتەکەی ئەنقەرە کرد، لە کۆنگرەی لەندەن، کە لە شوبات/ئاداری ۱۹۲۱ بەسترا،وەفد ی حکومەتی ئەنقەرە توانی هاوپەیمانێتی ئاشکرا لەگەڵ پاریس و رۆما پێك بێنێ، ئینگلیزیش رازی بوو کە چیتر باسی مافی چارەی خۆنووسینی کوردستان و دەوڵەتی نەتەوەیی بۆ کورد نەکات[1].

هەرچی پەیمانی فرانکلین/ بۆیۆن بوو کەلە ۱۹۲۱/۱۰/۲۰ لە نێوان تورکیا و فەرەنسا مۆرکرا، کاریگەرییەکی راستەوخۆی لەسەر چارەنووسی دۆزی کورد هەبوو، هەروەها مەسەلەی مافی چارەی خۆنووسین و دەوڵەتی ئایندەی کوردستان و حوکمی زاتی ئیداری (بۆ کوردان) بە شتێکی پێویست نەبوو دانا[2]. ئەمەو ئەگەر بزانین لەپاش جەنگی یەکەمی جیهان (کلمەنسۆ)ی فەرەنسی لە دژی تورکان دەیوت نابێ لەمەودوا گەلانی غەیرە تورك لە ژێر دەسەڵاتی تورك دابن، بەڵام پاش ئەوەی لە رێگای ئەو رێککەوتن نامەیە (فرانکلن/بۆیۆن) دەسەڵاتی رەهای سوریای بۆ تەواو فەراهەم هات،

نەك هەر پشتی لە دۆزی کورد کرد، بەڵکو هەروەك چۆن ئینگلیز لە ناوچەی ژێر دەسەلاتی خۆی کەوتە لێدانی بزوتنەوەی ئازادیخوازی کورد، ئەویش بەهەمان شێوە کەوتە لێدانی بزوتنەوەی ئازادی خوازی کورد لە کوردستانی رۆژئاوا. هەروەها دەورێکی گرنگیشی بینی لە سەر کوتکردنی راپەرینی ١٩٢٥.

## دووەم: دەوری سۆڤیەت لە هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی سیڤەر

دەوری سۆڤیەت لە هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی سیڤەر بە حەتمی کردنی داگیرکردن و دابەشکردنی کوردستان لە هاوپەیمانەکان بە هێزتربوو.

لە دیدی سۆڤیەت نیازی ڕاستەقینەی بەریتانیا و فەرەنسا لە پەیمانی سیڤەر ئەوە بوو کە بەرگری لە بلاوبوونەوەی شوێنەواری شۆرشی ئۆکتۆبەر بکەن.

دەیانویست دەوڵەتێکی پاشکەوتووی دەرەبەگایەتی دروست بکەن،کە تورکیاو روسیای سۆسیالستی لێك جیا بکەنەوە ببێتە نوختەیەکی ستراتیژی دژی یەکێتی سۆڤیەتی لە نزیك کانگاکانی نەوتی قەوقاز [٣]. لەو پێوەدانگە میکافیلیە سۆڤیەت لە ١٦ی ئاداری ١٩٢١ پەیوەندی راستەوخۆی بە ئەنقەرە کردو لەرێگای پەیمانی (الصداقة والأخوة) ، سۆڤیەت یەکەم دەوڵەتی مەزن بوو لە ناوچەکە ئیعتیرافێکی رەسمی بە حکومەتی ئەنقەرە کردو نوێنەری ئەتاتورکی وەك نوێنەری بۆرژوای نیشتمانی لە کۆنگرەی باکۆ قەبوڵ کرد [٤]. پاساوی سۆڤیەت بەوەی کە حکومەتی ئەنقەرە خوارووی سۆڤیەت لە هەڕەشەی ئیمپریالیزم دەپارێزێ، پاساوێکی بێ بنەچەیەو ئەصڵی بابەتەکە ئەوەیە کە لە لایەك سۆڤیەت دەیویست دەوری خۆی هەبێ لە شوێنێکی وەك تورکیا هەروەها بە حوکمی ئەوەی کوردیش لە نێو یەکێتی سۆڤیەت دا هەبوو.بە واتای لەگەڵ تورکیا هاوکێشە بوو. لەو روانگەوە سۆڤیەت پشتی لە کوردو ئەرمەن کرد [٥] لەپاشانیش

هەروەك ئینگلیزو فەرەنسییەکان، سۆڤیەت دەوری گرنگی بینی لە فەشەل پێهێنانی راپەرینی پیران وئاگری داخ [٦]،

## سێیەم: ناکۆکیو ناتەبایی سەرانی کورد

دووبەرەکی سەرانی کورد، هۆکارێکی مەزن بوو بۆ داگیرکردن و دابەشکردنی کوردستان، بەرەیەك لە ئەفسەرو سەرکردە خێڵەکییەکان تەواو لەژێرکاریگەری دیماگۆژیەتی ئەتاتورك دابوون و باوەڕیان بە دەوڵەتی کوردی نەبوو، هەرچی بەرەی رۆشنفکرانی ناسیۆنالیستی بوون، ئەوانیش هەر چاوەڕێ بوون رۆژئاوا دەوڵەتێکیان بۆ دروست بکا. بەمجۆرە عەقڵیەتی خێڵەکی سەرەك خێڵەکان و ناکامڵی تێگەیشتنی عەسکەری عەقڵیەتی عەسکەرتاریەتی ئەفسەرە کۆنەکان و دبلۆماسیەتی نا کامڵ و عەقڵیەتی سادەی رۆشنفکرانی کورد بوون بە پاڵپشتێکی ناراستەوخۆ بۆ سەرکەوتنی کەمالیەت ولە بەین بردنی یۆتۆپیای کورد.

## چوارەم: هەرەسی حکومەتی ئەستەمبوڵ و دامەزراندنی حکومەتی ئەنقەرە

لە سەردەمی پەیمانی سیڤەردا دوو دەسەلاتی تورکی لە تورکیا هەبوو، حکومەتی ئەستەمبوڵ کە بە ناو حکومەتی خەلافەبوو، ئەو حکومەتە دانی بە ندەکانی سیڤەر نابوو. ئەو حکومەتە هەرچەندە لەچاو حکومەتی ئەنقەرە بێ دەسەلات بوو، بەلام ئەگەر ئینگلیز هەرەسی پێ نەهێنابا دەورێکی ئیجابی دەبوو لە ئایندەی مەسەلەی کورددا،چونکە هەر هیچ نەبێ لە لایەك دانی بە مەسەلەی کورد نابوو لە کۆمەڵەی گەلان.

هەروەها وەك حکومەتەکەی ئەنقەرەش توند ڕەو نەبوو سەبارەت بـە مەسـەلەی لەومی لە تورکیادا. هەرچی حکومەتی ئەنقەرە بوو پەیمانی سیڤەر بە سێدارەی تورکیا دادەنا. هەوەها ئەو ئیعتیرافەی حکومەتی ئەستەمبولّی بە رەوابینینی مەسەلەی کورد بە خیانەتی نیشتمانی دەزانی [٧] .. بۆ ئایندەی ستراتیژی ئینگلیز لـە نـاو ح ۚكـەدا، ئینگلیز حکومەتی ئەنقەرەی سەرخست و حکومەتی ئەستەمبولّی فەشەل پێهێنا.

دوای سەرکەوتنە دبلوماسیو عەسکەرییەکانی کەمالیـەت رەوتـی هـەموو هێزە نێو دولّەتییـەکان بـە بـەرژەوەندی تورکیـا گـۆڕدرا. هـەر بـۆ ئـەوەی کەمالیـەت چاکـەی رۆژئاوا بداتـەوەو ئـەو بەڵێنـەی لـە ئـەرزەرۆم مستـەفا کـەمال دابـووی لـە ئـەرزی واقیـع بهێنێتەدی بەوەی تورکیای بنکەی دەسەلاتی سیاسیو رۆحی ئیسلام بگۆڕێ بە تورکیای لادینی. پاش ئەوەی لە کۆنگرەی مۆدانیـا لـە ١٩٢٢/١٠/١١ یۆنـان دەسـتبەرداری هـەموو خاکی تورکیا بوو، مستەفا کەمال لە مانگی یازدەی ١٩٢٢ نیزامی سەڵتەنەتی لە دەوڵـەت جیاکردەوە. هەر تەنیا بیست رۆژیش دوای ئیلغاکردنی سەڵتەنەت وەفدی ئەنقەرە بەرەو کۆنگرەی (ئاشتی) بەڕێکەوت، بۆ ئـەوەی بـەڵێنی دامـەزراندنی دەوڵـەتی لادینـی تورکیـا وەربگرێ.

لە ١٩٢٢/١١/٢٠ کۆنگرەی ئاشـتی لـە لـۆزان دەسـتی بـە کارەکـانی خـۆی کـرد. وەفدی تورکیا بە سەرۆکایەتی (عیصمت ئینینۆ) بوو، هەرچی وەفدی ئینگلیزیش بوو بـە سـەرۆکایەتی (لـۆرد کـێرفرۆن)بـوو.وەفـدی تورکیـا، تـەواوی تورکیـاو بەشـە بـاکوری کوردستانی بەدەست هێنـابوو، هەربۆیـە داوای هـەموو ویلایـەتی موسـڵیش دەکـرد تـاکو چیای حەمرین، هەرچی حکومەتی ئینگلیزیش بوو داوای زێتر لە سنوری ویلایەتی باکوری دەکرد [٨].

لـە دانیشـتنی یەکـەم بـە هیـچ نەگەیشـتن، بـەلام لـە دانیشـتنی شـوباتی ۱۹۲۳ بڕیاریاندا کە مەسەلەی ویلایـەتی موسلّ لەبەرنامـەی کۆنگـرەی ئاشـتی دوور بخەنـەوە. کۆنگرەی ئاشتی لـۆزان مەسـەلەی سـنوری نێـوان تورکیـاو عێـراقی بەچارەسـەرنەکراوی هێشتەوە. ئەمەو ماوەی نۆمانگ دانرا کە ئەو مەسەلەیە بەر ێگایـەکی نێـو دەوڵەتی‌یـەوە چارەسـەر بکرێ هـەروەها بڕیـادرا کـە ئەگـەر دوو دەوڵەتـە کـە (تورکیـاو بـەریتانیا) نەیانتوانی لەو ماوەیدا رێککەون، مەسەلەکە دەنێردرێتە ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان [٩].

ئەوەبوو لە ٢٤/تەموزی ۱۹۲۳ پەیمانی لۆزان یان مۆر کـردو پـەیمانی سـیڤەریش هەڵوەشاندرایەوە، هەرچی مەسەلەی موسڵیش (دابەشکردنی کوردسـتان) بـۆ کۆمەڵـەی گەلان ناردرا.

لـە پـەیمانی لۆزانـدا بـە هیـچ جۆرێـك باسـی مەسـەلەی کـورد نـەکراوە تـەنیا ئەوەندەی تێدایە کە پێویستە رێز بۆ مافی فەرهەنگی‌و ئایینی کەمایەتی‌یـەکان دابنـرێ [١٠] لـەدیدی ئینگلیـز ئـەو کەمایەتی‌یـە نەتـەوەیی، مەبەسـت لـە کـوردە، هـەرچی لـە دیـدی تورکـەکانیش بـوو مەبەسـت لـە کەمایەتی‌یـە غـەیرە موسـوڵمانەکانە [١١].هـەرچۆنێك بـێ پەیمانی لۆزان بونیادی ئـەو دەوڵەتـە خەیاڵیـەی سیڤەری روخـاند. بـە واتـای لـە لـۆزان مەسەلەی کورد وەك مەسـەلەی نەتـەوەیی کـە مـاف بڕیـاردانی مـافی چـارەی خۆنوسـین هەبێ وەك لە سیڤەر ئاماژەی بۆ کرابوو، لەبەین بردرا، تەنها چەند بـەندێك سـەبارەت بـە کوردو کەمایەتی غەیرە موسڵمان لە تورکیا دانران، کە ئەگەر بێت و داکۆکی‌یان لێ کرابا، هـەروەك بڕیـاروابوو کـە هاوپەیمانـەکان بـەرگری لێ بکـەن، ئـەوا نـەدۆزی کـورد وای بەسەردەهات، نە دوڵەتانی وەك تورکیا و عێراقیش وا پاشکەوتوو بێ دەسـەڵات دەبـوون لە رۆژهەلات.

لەهەر سێ بەندی ٣٩،٣٨، ٤٠ی بەشی سێیەمی پەیمانی لۆزانـدا هـاتووە: حکومەتی تورکیا بەڵێن بە کوردەکان دەدات، کە کەمینەیەکی نەتەوەیە لـە تورکیا پێك دێنن، بە ئاشکرا بە زمانی خۆیان بدوێن. لەبەردەم دادگاکانی تورکدا مافی ئاخاوتن و قسە پێکردنیان بە زمانی زگماکی خۆیان هەیە هەروەها مافی ئەوەیان هەیە رۆژنامەو کتێب بە زمانی خۆیان بلاو بکەنەوە [١٢]. بەپێی بەندی ٣٧ توکیا بەڵێن دەدات کە هەرگیز یاسایەك دەرنەکا یان بریارێك دەربخات ئەو مافانەی لە هەرسێ بەندەکەی گۆرپن خرانە بەر چاو پێشێل بکا [١٣]. هەروەها لـە بەندی ٤٤ دا هاتووە کە تورکیا بەڵێنێکی نێو دەوڵەتی داوە لەسەر پیادەکردنی ئەو بەندانە هەروەها گوێ رایەڵی هاوپەیمانەکان و کۆمەڵەی گەلان دەبێ لەو بارەیەوە.... هەروەها لەبەندەکەدا هاتووە کە ئەگەر تورکیا لە مەرجی جێبەجێ کردنی ئەو بەندانە سستی‌و کەمتەرخەمی بنوێنێ یاخود پاشەگەزبێتەوە ئەوا ئەو دەوڵەتانەی لە دروستکردنی کۆنگرەی ئاشتی لۆزان بەشداربوون کۆمەڵی گەلان پەنا دەبەنە بەر چەك بۆ پیادەکردنی ئەو بەندانە [١٤]. پاش ئەوەی تورکیا توانی هاوپەیمانەکان بە تایبەتی ئینگلیز رازی بکەن واز لەمەسەلەی دەوڵەتی کوردی‌و حوکمی زاتی کوردەکانی ئەنادۆڵ بێنن و هەموو مەسەلەی کورد لە باکوری کوردستان بکرێ بە مەسەلەی کەمە نەتەوایەتی، لە ١٩٢٣/١٠/٣٠ جاری دەوڵەتی لادینی تورکیای دا. ئەمەو لە (٣) ئازاری ١٩٢٤ بۆ زیاتر پەیرەوکردنی دەستوری خاچ پەرستی ئینگلیز ئەنجومەنی باڵای ناسیۆنالی تورك هەرسێ ژمارە ٤٢٩، ٤٣٠، ٤٣١ سەبارەت بـە جیاکردنـەوەی ئیسلام لە دەوڵەت و بریاری هەڵوەشاندنەوەی خەلافەتی ئیسلامی و داب و نەریتی ئیسلامی لـە تورکیا [١٥]. بەمجۆرە، تورکیا هەم ئیسلامی لە دەوڵەتی تورکیا جیاکردەوە هەم مەسەلەی کوردی لە باکوری کوردستان فەرامۆش کرد. پاش ئەم دوو هەنگاوە دەیویست باشوری کوردستانیش لەرێگای کۆمەڵی گەلانەوە داگیربکات، بەڵام موسڵ ناوچەیەکی نەوتی بوو

هەر بۆیە ئینگلیز رازی نەبوو بە تورکیای بدات پاش ئەو ماوە زەمەنییەی دانرابوو بۆ چارەسەری مەسەلەی ولایەتی موسلّ یان ریکتر بلّیین دابەشکردنی کوردستان هەردوولا (تورکیا وبەریتانیا) ریککەوتن کە مەسەلەکە بدریّ بە کۆمەلّەی گەلان. لە ٣٠ سێپتێمبەری ١٩٢٤ ئەنجومەنی کۆمەلّەی نەتەوەکان(گەلان) بڕیاریدا کە بۆ لێکۆلّینەوە لە مەسەلەکە لیژنەیەك لە سێ ئەندام پێکبێنێ[١٦] . ئەوەبوو ئەنجومەنی کۆمەلّی گەلان لە ١٩٢٤/١١/١٣ ئەو بڕیارەی بەجێ هێناو لیژنەیەکی لەم سێ ئەندامە پێکهێنا : کۆنت تەلەکی سەرۆك وەزیری پێشووی هەنگاریا - مەجەرستان دووەم مسیۆ ویرسنی سویدی سێیەم کۆلۆنیل پاولّس [١٧]، لیژنەیەك لە ١٦ یەنایەری ١٩٢٥ هاتنە بەغدا.پاش ئەوەی لیژنەکە سەردانی هەردوو حکومەتی تورکی‌و ئینگلیزیان کرد، وەفدێکی عێراق و تورکیان لەگەلّ هات بۆ ناوچەکە، تورکیا پێشنیاری کرد کە بۆ ئەوەی خەلّك نەزەری خۆی دەربڕێ ریفراندۆم بکرێ. بەلاّم بەریتانیا بەرهەلّستی ئەو پێشنیارەی کرد [١٨]. لێرەدا دەمانەوێ ئامارە بەوە بکەین کەهەموو مەسەلەی کاری لیژنەکەش، سیناریۆیەکی ئینگلیزی سەد لە سەدی بوو چونکە ئەگەر راستە لیژنەکە بۆ لێکۆلّینەوە لە چارەنوسی گەلی کورد هاتبوو، بۆچی وەفدێکی کوردیش بەشداری کاری لیژنەکە نەبوو، خۆ ئەصلّی مەسەلەکە بۆ کوردان بوو! ئەمەو بۆ مێژوو لیژنەکەش بڕیاریدا کەکورد نە عەرەبن و نە تورکن و نە فارسن، بەلاّم لە فارس نزیکترن تا لەوانی تر. کورد لەتورك جیایە جیاوازیەکەشی ئاشکرایە. لەمەش زیاتر لەعەب دوورەو جیاوازی لەگەلّ هەیە [١٩]. ئەی کە کورد نەعەرەب بێ‌و نەتورك، بۆچی‌خۆی‌و ولاّتەکەی دەبێ یان ببێ بە بەشێك لە تورك و خاکی تورك یان عەرەب و خاکی عەرەب؟! بێجگە لەو راستیەی سەرەوە، هەروەها لیژنەکە دانی بەوە دەنێ کە ئەگەر تەنیا باری رەگەزی بە نەزەری ئیعتیبار وەربگرێ، ئەوا دەبێ دەولّەتێکی سەربەخۆی کورد لە ناوچەکەدا دابمەزرێ چونکە کوردەکان پێنج

بەش لە هەشت بەشی دانیشتوانن. کاتێك مەسەلەکە بەم جۆرە چارەسەر بکرێ‌پێویستە یەزیدیەکانیش کە زۆر وەك کورد دەچن لەگەڵ کورد حیساب بکرێن، تورکەکانیش کە بەئاسانی لەناو کوردا دەتوێنەوە ئەودەم کوردەکان دبنە حەوت بەش لە هەشت بەشی دانیشتوان [20]. عەدالەتی ئینگلیز لەوە دابوو کە نەتەوەیەك حەوت بەش لە هەشت بەشی ناوچەیەك پێکبێنێ چارەنوسی بەنەتەوەیەکی تر تەسلیم بکرێ کە یەك لە هەشتی دانیشتوانی ناوچەکە پێك بێنێ. بەم جۆرە هەر دەوڵەتەو بە پاساوێك، کە تەنیا قازانجی ستراتیژی خۆی بەنەزەر وەرگرت بوو، لەو سیاسەتەی ئینگلیز بێ دەنگ بوو مەسەلەی موسڵ، مەسەلەی چارەنوسی‌گەلی باشوری کوردستان بە قازانجی بەریتانیا چارەسەرکرا [21].پاش ئەوەی تورکیا مافی ئەوەی پێدرا بەشە کوردستانی باکوور لە بەرامبەر راگەیاندنی دەوڵەتێکی لادینی لە شوێن خەلافەتی ئیسلامی رابگەیەنێ لە ٣٠ی ئایاری ١٩٢٦ د. ئاراس بە باڵوێزی ئینگلیزی لە ئەنقەرە راگەیاند کە حکومەتی ئەنقەرە رازی‌یە کە ١٠٪ی نەوتی عێراقی بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ بدرێتێ، بەڵام لەپاشان لە ٦/٥ تورکیاو ئینگلیز رێککەوتن کە لەبری بەشە نەوت سەد هەزار پاوەند بەتورکیا بدرێ. بەم جۆرە پرسی مووسڵ کۆتایی پێهات [22]. ئەمەو هەر لەهەمان مانگ وەفدی عێراق و تورکیا و بەریتانیا لە ئەنقەرە کۆبونەوەو بریار لەسەر دابەشکردنی کوردستان درا.

تورکیا ئەو بەشە کوردستانیش بە بەشێك لە تورکیا دەزانێ، پاش لەدەست دانی ئەو بەشەی وڵاتی کورد وتی: ئێمە ئەو قوربانیەمان (رازی بوون بە داگیرکردن و دابەشکردنی ویلایەتی موسڵ لە لایەن عەرەب و ئینگلیز) بەرامبەر بە دۆستایەتی لە لەگەڵ ئینگلیزو ئاشتی لەگەڵ عێراقدا [23]. ئەمەو وەك تاکتیکێك لیژنەی لێکۆڵینەوە لەمەسەلەی موسڵ، بریاریان دابوو کە ئەگەر بێتو عێراق گەرەنتی‌و بەڵێنی بەهێز نەدا بۆ کوردان کە ئیدارەیەکی ناوخۆی سەربەخۆ دابمەزرێنن، ئەوا لەپاش چوار ساڵ لە

قەبوڵکردنی ڕێکەوتنی ئینگلیزو عێراق و نەمانی دەسەلاتی کۆمەڵەی گەلان لەسەر عێراق ئەوا زۆربەی کوردەکان بە چاکتر دەزانن بگەڕێنەوە ژێر ئیدارەی تورکیا لەوەی ژێر دەستەی حکومەتی عێراق بمێنێتەوە[٢٤]. بەلام وەك ئەحمەد موختار وتەنی:

**ئەم قەڕارەی عوسبەیەی خەڵکی ئەڵێن بۆ کورد ئەبێ**

**هەر قسەی ڕووتە و قسەش ناچێتە نێو گیرفانەوە**

هەر بۆیە بە ڕەزامەندی هەموو زلهێزەکان ڕاستەوخۆ یان نا ڕاستەوخۆ لە ١٩٢٦/٧/١٨ مەسەلەی داگیرکردن و دابەش کردنی کوردستان بوو بەڕاستیەکی حەتمی بەسەر کورد سەپێندرا. لە تورکیا بەپێی دەستوری سزای تورك ژمارە(٨٨) هەموو شتێك دژ بە تورکیا قەدەغەکراو هیچ حسێبێکیش بۆ کورد وەك کەمایەتیەکی نەتەوەیی نەکرا، پاش ئەوەی کورد لە دژی ئەو داگیرکردنەو دابەش کردنە و سیاسەتی لادینی تورکیا ڕاپەڕین، هەموو دەوڵەتە زلهێزەکان وەك یەکێتی سۆڤیەت و فەرەنساو ئینگلیز هەروەها ئێران بوونە یەك بەرە بۆ لەبەین بردنی شۆڕشی کورد. بەڕەسمیش لەپاش کوژاندنەوەی ڕاپەڕینی شێخ سەعیدی پیران بەپێی ئەو بەندانەی دەستوری تورکیا ١٤٠، ١٤١، ١٤٢، ١٦٣ زمانی کوردی قەدەغەکرا[٢٥]. دەوڵەتی (عێراقی عەرەبیش) هەرچ ڕاپەڕینێك لە باشوری کوردستان کرابێ بە پاڵپشتی ئینگلیز سەرکوتی کردووە.

# پەراوێزو سەرچاوەكان

١. لازاريف، المسأله الكرديه، ص٢٧١.

٢. سەرچاوەی پێشوو.

٣. قاسملۆ كوردستان و كورد، لا:٥٥.

٤. گۆڤاری رۆژی نوێی ١٩٦٠ و رۆژنامەی رابوون ژ ١٢، ١٩٩٤.

٥. حیكمەت محەمەد كەریم، شۆرشی نەگۆرو جیهانی گۆڕ د

٦. لە دیدی سۆڤیەت راپەرینەكەی ١٩٢٥ راپەرینێكی (كۆنەپەرستی) بووە ئینگلیز دەستی لەو راپەرینە هەبووە. بۆ رەددی ئەو رایەی سۆڤیەت و ماركسیەكان بروانە (ماركسیەت و دیموكراسیەت بۆ كورد دوو رووی یەكشت بوون).

٧. محسن العبيدي، التطورات السياسية الداخلية في توركيا.

٨. ادموندز،كرد، ترك، عرب، ص٢٨٢.

٩. قاسملۆ، لا: ٧٩/٧٨.

١٠. سەرچاوە پێوو، لا: ٥٧.

١١. لازاريف، المسألة الكردية.

١٢. محمد شيرزاد، نچال الاكراد.

١٣. د.جمال نەبەز، كوردستان و مەسەلەی كورد.

١٤. محمد شيرزاد، نضال الأكراد.

١٥. رۆژنامەی رابوون، ژ(٤).

١٦. قاسملۆ، لا٧٩.

١٧. ادمونز، كرد، ترك، عرب ص٢٦٨.

١٨. قاسملۆ، لا٧٩.

کوردستانیش لەر یگای کۆمەڵی گەلانەوە داگیربکات، بەڵام موسڵ ناوچەیەکی نەوتی بوو

١٩.سەرچاوەی پێشوو، لا٨٠.

٢٠.سەرچاوەی پێشوو، لا٨٠.

٢١.لازاريف، المسألة الكردية، ص٢٧٤.

٢٢.کمال ئۆقە، کرۆنۆلۆجیای مەسەلەی موسڵ، لا ٧٥.

٢٣.سەرچاوەی پێشوو.

٢٤.ادمونز، ص٢٦٨.

٢٥. گۆڤاری بانگی هەق، ژ(١) ١٩٩١.

# کورتەی باسەکە

لەم نوسینەدا سێ راستی زۆر گرنگ پێکراون:

١. جیاکردنەوەی دەولەتی عوسمانی ئیسلامیو دولەتی عوسمانی (ئیتحادی)و تورکیای لادینی. بەنەزەری ئێمە دوای ئەوەی گروپیئیتحاد و تەرەقیلە رێگای کودەتاکەی ١٩٠٨ بوون بە حاکمی دەولەتی عوسمانی مەسەلەی ئیسلام و دەولتیان (بە نهێنی) لەیەك جیا کردەوە. دەولەتی عوسمانی ئیسلامی راگەیانراو گۆردرا. لە رووی قەومیش هەرچەندە ئیتحادیەکان تەبەنی ناسیۆنالیستی تورکیایان کرد بەلام لە راستیدا هەروەك چۆن گروپێکی ئیسلامی نەبوون (کەبانگەشەیان دەکرد) بەهەمان شێوەش مەبەستیان نەبوو خزمەتی تورك و بەرژەوەندی تورك بکەن چونکە سەرکردەکانی ئەو گروپە بەرەسەن کەمیان تورك بوون هەر بۆ نمونە ئەنوەر پاشا کوڕی جولەکەیەکی هەلگەڕاوە لە ئیسلام بوو، جاویت پاشا جولەکەی دۆنمە بوو، قەرەسۆ جولەکەی ئیسپانی بوو، تەلعەت پاشا غەجەری بوو، ئەحمەد رەزا شا نیوە چەرکەزیو نیوە مەجەری بوو (بڕوانە، د. یوسف القرضاوي الحلول المستوردة ص١٥٢) هەرچی مستەفا کەمال بوو تاکو ئێستاش بە تەواوی نازانرێ کە بەرەسەن تورك بوبێ (بڕوانە د. عبدالله عزام المنارة المفقودة) هەرچی فەیلەسوفی تۆرانیەتیش بوو - زیاء الب کوك - بە رەسەن کورد بوو (تەماشای د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەرەیەك....بکە).

٢. بەواتا ئەو گروپە، ماسۆنی بوون و تەواو لە راژەی یەهودیەت و نەسرانیەت دابوون بە جۆرێك کەسێکی وەك مستەفا کەمال هەر بەروخاندنی یەکجارەکی خەلافەتی ئیسلام دلی ئاوی نەخواردەوە، هەر بۆیە لەسەرەمەرگ بۆ ئەوەی ئیسپات بکات کە نەك تورك نییە بەلکو دژی بەرژەوەندیو شکۆی تورکە، داوا لە پێرسی

لۆرینی سەفیری ئینگلیز لە ئەنقەرە دەكات كە ببێ بە سەرۆكی توركیا لە پاش مردنی خۆی (بڕوانە: الرجل الصنم)

٣. لە قۆناغی فەرمانداری ئیتحادیەكان ١٩٠٨-١٩١٨ پرۆژەی لە ناوبردنی خەلافەتی ئیسلامیو بەتوركی كردن و داگیركردنی كوردستان و ناسنامەی قەومی نەخشەی بۆ كێشرا.

لە قۆناغی دوای جەنگی یەكەمی جیهان، جێبەجێ كردنی پرۆژەكە دەستی پێكرد. لەو قۆناغەدا، یەكەم هەنگاوی كاری داگیركەرە هاوپەیمانەكان دابەش كردنی دەوڵەتی عوسمانی خاكی كوردستانی عوسمانلی بوو. سەبارەت بە دابەش كردنی كوردستانەوە، دەوری هاوپەیمانەكان -تاكە- رۆڵ و فاكتەر نەبوو بەڵكو دەمارگیریو شۆڤینیەت و سەراتی تورك و عەرەبیش (یەهودیەت و سەلیبیەت ئاراستەی دەكردن) رۆڵی ئەگریسی خۆیان لەو كردارە نامرۆڤانەیەدا بینی. لایەنی سێیەمیش كە دەورێكی لاشعوریو ئاراستەوخۆی بینی لەو كردارەدا، عەقڵیەتی دەسەلاتی كورد بوو. رووناكبیرو سەركردە خێڵەكیەكانی كورد تەواو لە هەردوو كاركتەری سامۆئیل بیكێت: ڤلادمیرو ئیستراكۆن، دەچوون. ڕوناك بە بیرە قەومیەكان چاوەڕێبوون دەسەلاتی داگیركەری ئینگلیزو فەرەنساو سۆڤیەت ببن بە گۆدۆ هەرچی سەركردە خێڵەكیەكانیش بوون چاوەڕێبوون مستەفا كەمال ببێ بە گۆدۆ، بەلام ئێستاشی لە گەڵدابێ ئەو دوو گرۆپە هەر لە چاوەڕێی گۆدۆ، بەلام گۆدۆ هەر نەهات و هەرگیز نایەت !!!

# ناوەرۆك